پێڕستی بابەتەکان

پوختەیەك:

خوێنەری بەڕێز: ئەم کتێبەی بەردەستت لە بنەڕەتدا بریتی بووە لە (وتاری ڕۆژی عەرەفەی ساڵی (١٤٣٢) کۆچی کە لە حەجی ئەو ساڵەدا لە ناو مزگەوتی (نەمیرە)دا لە لایەن زانای ڕێزدار (عبد العزيز بن عبد الله آل الشيخ) (موفتی تێکڕای شانیشینی عەرەبستانی سعودیّ و سەرۆکی دەستەی گەورە زانایان)ە وە پێشکەشکراوە و دواتر نووسراوەتەوە و بە ناونیشانی (الإسلامُ منهاجُ الحياة) لە لایەن (وەزارەتی ئەوقاف وبانگەواز و ڕێنمایی / وەکیلی وەزارەت بۆ کاروباری مزگەوتەکان وبانگەواز وڕێنمایی)ـەوە لە چاپدراوە .

ئێمەیش لەبەر زۆر گرنگی و پڕ سوودی بابەتەکە بە پێویستمان زانی کەوا وەریبگێڕینە سەر زمانی کوردی شیرین .

بسم الله الرحمن الرحيم

* پێشەکی وەرگێڕ :

الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ، وَالْعَاقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ ، وَصَلَّى اللّٰهُ وَسَلَّمَ عَلَى عَبْدِهِ وَرَسُوْلِهِ نَبِيِّنَا مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِهِ وَأَصْحَابِهِ أَجْمَعِيْنَ .أَمَّا بَعْدُ:

خوێنەری بەڕێز: ئەم کتێبەی بەردەستت لە بنەڕەتدا بریتی بووە لە (وتاری ڕۆژی عەرەفەی ساڵی (١٤٣٢) کۆچی کە لە حەجی ئەو ساڵەدا لە ناو مزگەوتی (نەمیرە)دا لە لایەن زانای ڕێزدار (عبد العزيز بن عبد الله آل الشيخ) (موفتی تێکڕای شانیشینی عەرەبستانی سعودیّ و سەرۆکی دەستەی گەورە زانایان)ە وە پێشکەشکراوە و دواتر نووسراوەتەوە و بە ناونیشانی (الإسلامُ منهاجُ الحياة) لە لایەن (وەزارەتی ئەوقاف وبانگەواز و ڕێنمایی / وەکیلی وەزارەت بۆ کاروباری مزگەوتەکان وبانگەواز وڕێنمایی)ـەوە لە چاپدراوە .

ئێمەیش لەبەر زۆر گرنگی و پڕ سوودی بابەتەکە بە پێویستمان زانی کەوا وەریبگێڕینە سەر زمانی کوردی شیرین .

جێی ئاماژە پێکردنە : سوپاس بۆ خوای گەورە لە پاش تێپەڕبوونی ساڵیک بەسەر ئەم وتارەدا لە حەجی ساڵی (١٤٣٣)دا گەیشتمە خزمەتی ئەم زانا زۆر گەورە و بەڕێزە و لە شوێنی حەوانەی تایبەتی خۆی بەرامبەر و نزیک لە (مزگەوتی زانا و پێشەوای پایەدار عبد العزيز بن باز رحمه الله) بۆ ماوەی زیاتر لە نیو سەعات لەگەڵیدا دانیشتم و زۆر ڕێزی لـێگرتم وپێشوازییەکی گەرمی لـێکردم و بە بایەخەوە گوێی لـێدەگرتم و پرسیاری بارودۆخی موسڵمانان و بانگەوازی ئیسلامەتی لە کوردستاندا لـێکردم وزۆر دوعای خێری بۆ خەڵکی کوردستان کرد و ئامۆژگاری کردم بە خزمەت کردنی ئیسلام و موسڵمانان و گرنگی و بایەخدان بە زانستی شەرعی و گەیاندنی بە موسڵمانان .

هەروەها (لە سەرەتای مانگی حاجییانی ئەو ساڵەوە تاوەکو ڕۆژی هەشتەمی و چەند ڕۆژی دوای تەواو بوونی حەج)ی ئەو ساڵەیش ئامادەی تێکڕای وتە و وەڵامدانەوەی بەڕێزیان بۆ ئەو پرسیارانەی کە ئاراستەیان دەکرا بووم، ئەمەیش

له شاری مەککەی پیرۆز لە ناو (مزگەوتی زانا و پێشەوای پایەدار عبد العزیز بن باز رحمه الله) لە پێش وپاش پێنج نوێژە فەرزەکان .

داواکارم لە خوای گەورە ئەو حەجەی لـێقەبوڵ کردبین، وە بەم کتێبەیش سوود بگەیەنێت بە موسڵمانان و لێمانی قەبوڵ بکات، بەڕاستی خوا بەخشندە و میهرەبانە .

وَصَلَّى اللَّهُ وَسَلَّمَ عَلَى نَبِيِّنَا مُحَمَّدٍ وَآلِـهِ وَصَحْبِهِ

***

إِنَّ الْحَمْدَ للهِ نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِيْنُهُ وَنَسْتَغْفِرُهُ وَنَتُوبُ إِلَيْهِ، وَنَعُوْذُ بِاللهِ مِن شُرُوْرِ أَنْفُسِنَا وَمِنْ سَيِّئَاتِ أَعْمَالِنَا، مَنْ يَهْدِهِ اللهُ فَلا مُضِلَّ لَهُ وَمَنْ يُضْلِلْ فَلا هَادِيَ لَهُ.

وَأَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لا شَرِيْكَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُوْلُهُ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَصَحْبِهِ وَسَلَّمَ تَسْلِمَاً كَثِيرَاً إِلَى يَوْمِ الدِّيْنِ.

أما بعد:

* ئامۆژگاری به ته‌قوا:

ئه‌ی خه‌ڵکینه‌:

له خوای گه‌وره بترسن ترسانێکی ڕاسته‌قینه‌، وه ئاگاتان له چاودێری خوا بێت بۆتان له کاتی نهێنی و چپه‌یشدا، بۆ ئه‌وه‌ی چاکه و خێرتان ده‌ست بکه‌وێت له دونیادا و سه‌رکه‌وتن و سه‌رفرازیش له دواڕۆژدا.

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ﴾[1].

واته‌: ئه‌ی ئه‌و که‌سانه‌ی که باوه‌ڕدارن له خوا بترسن ترسانێکی ڕاسته‌قینه که حه‌ق و مافـی ته‌قوای تێدا به دی بێت، وه نه‌شمرن ئیللا به موسڵمانی نه‌بێت.

* ئامانج له ناردنی پێغه‌مبه‌ر (مُحَمَّد):

---

(1) سوره‌تی آل عمران: **102**.

خوای گەورە پێغەمبەر (مُحَمَّد)ی ناردووە بە ڕێنمایی و دینی حەق [واتە: بە زانستی بەسوود و کردەوەی چاکە] مژدەدەر و وریاکەرەوەیە بە پەیامێکی گشتی بۆ هەموو بونەوەر، بۆ ئەوەی خەڵکی لە تاریکاییەکانی بێباوەڕی و گومڕاییەوە دەربهێنێت بۆ رووناکی یەکخواپەرستی و ئیمان وباوەڕ، وە لە تاریکاییەکانی نەفامی و نەزانیەوە بۆ رووناکی زانست و هۆشمەندی وژیری، وە لە پەرستنی نەفسەکان و شەیتانەوە بۆ پەرستنی خوای دەسەڵاتداری پاداشتدەرەوە، وە لە ئارەزووە ئاژەڵیەکانەوە بۆ ڕەوشتە بەرزە ئیسلامییەکان، وە لە وابەستەبوون بە ماڵی دونیای کۆتایی پێهاتووەوە بۆ وابەستەبوون بە ماڵی دواڕۆژی هەتاهەتایی وپڕ نازونیعمەت لە ناو باخە بەرزەکانی بەهەشتدا .

* ئیسلام بەرنامەی ژیانە بۆ مرۆڤەکان:

ئەی موسڵمانان :

بەڕاستی خوای گـەورە ئاینی ئیسلامـی داناوە بۆ ئەوەی ببێت بە بەرنـامـەی ژیانـی مـرۆڤـایـەتی کە بە پـێی دەقـاودەقـی بـڕیار و ڕێنماییەکانـیەوە ژیانیـان بەڕێـوە ببەن، چونکە هیچ بوارێک نییە لە بوارەکانی ژیانی دونیا ئیللا ئاینی ئیسلام بڕیار و ڕوونکردنەوەی تێدا هەیـە لە بارەیـەوە، بۆ ئـەوەی بەندەکـان ئەو ئامانـج و مەبەستـەی کە بۆی دروستکراون بەجێبێـنن، خوای گەورە فەرموویـەتی : ﴿وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ﴾[1].

واتە : من جنۆکە و مرۆڤم دروست نەکردووە ئیللا بۆ ئەوە نەبێت کە بە تەنها من بپەرستن .

وە بۆ ئەوەی تێکڕای ژیانیان ڕێک وڕاست ودامەزراو بێت بە روخسار وشێوەی ئیسلام لە بوارەکانی عەقیدە وبیروباوەڕ وپەرستن وهەڵسوکەوت وباری کەسێتی ومامەڵە وئەخلاق وڕەوشت وسیاسەت وفێرکردن وجگە لەوانەش، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿قُلْ إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٦٢﴾ لَا شَرِيكَ لَهُۥ وَبِذَٰلِكَ أُمِرْتُ وَأَنَا۠ أَوَّلُ ٱلْمُسْلِمِينَ﴾[2].

(1) سورەتی الذاريات: 56.

(2) سورەتی الانعام: 162و163.

واتە : ئەی پێغەمبەر ﷺ بە خەڵکی بڵێ: بەڕاستی نوێژ وحەیوان سەربڕین و ژیان و مردنم هەمووی بۆ خوای پەروەردگاری هەموو جیهانیانە، هیچ شەریکی نییە و بەوەیش فەرمانم پێکراوە وبڕیاریش دەدەم کەوا من یەکەم کەس بم ملکەچی فەرمانەکانی خوا ببم.

وە ئاینی ئیسلام ئەم بەرنامەیەی داڕشتووە و وێناکردووە بە گەورەترین روونکردنەوە وئاشکراترین دەستەواژە، هەر بۆیە بەڵگەکانی جێگیر کردووە و دروشمەکانی ڕوونکردووەتەوە و بناماکانیی جێگیر کردووە بە بێ چەواشەبوون و ئاڵۆزی، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿كِتَٰبٌ أَنزَلۡنَٰهُ إِلَيۡكَ مُبَٰرَكٞ لِّيَدَّبَّرُوٓاْ ءَايَٰتِهِۦ وَلِيَتَذَكَّرَ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ﴾(1).

واتە: ئەم قورئانە کتێبێکی پڕ خێر و بەرەکەتە دامانبەزاندووە بۆ تۆ بۆ ئەوەی شوێنکەوتووانت تێڕامان وتێفکرانی ئایەتاکانی بکەن و بۆ ئەوەی خاوەن دڵ وژیرییەکان پەندی لێوەربگرن .

هەروەها فەرموویەتی : ﴿مَّا فَرَّطۡنَا فِي ٱلۡكِتَٰبِ مِن شَيۡءٖۚ﴾(2).

واتە: ئێمە لەم کتێبەدا کەمتەرخەمیمان نەکردووە و هیچ شتێکمان بەجێنەهێشتووە تۆمار نەکرابێت .

هەروەها فەرموویەتی:﴿وَنَزَّلۡنَا عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ تِبۡيَٰنٗا لِّكُلِّ شَيۡءٖ﴾(3).

واتە: ئێمە قورئانمان دابەزاندووەتە سەر تۆ کە روونکردنەوەی هەموو شتەکانی تێدایە .

واتە: ئاینی ئیسلام هەموو بوارەکانی ژیانی تێدا باسکراوە و روونکردنەوەی لەسەرداوە و هیچ شتێک نییە باسی نەکردبێت .

* بنەماکانی بیروباوەڕی ئیسلامەتی:

---

(1) سورەتی ص: **29**

(2) سورەتی الانعام: **38** .

(3) سورەتی النحل: **89** .

ئاینی ئیسلام بنەماکانی بیروباوەڕی روونکردووەتەوە بۆ موسڵمانان لە باوەڕبوون بە خوا و پاک کردنەوەی یەکخواپەرستی بۆی ، وە ئەنجامدانی هەموو پەرستنەکان بۆ خوای گەورە و ئەم پەرستنە هیچ کەسێک شایستەی نییە جگە لە خوای گەورە نە فریشتەیەکی نزیک لە خوا و نە هەواڵپێدراوێکی نێردراویش .

وە ڕاستێتی و حەقیقەتی یەکتاکردنەوەی خوا بە ناو و سیفەتەکانی بۆیان روونکردووەتەوە بەوەی کەوا ناو و سیفەتەکان بۆ خوای گەورە بسەڵمێنن بەو شێوازەی کە شایستەیەتی، سەلماندنێکی بێ نموونە بۆ هێنانەوە، وە پاکڕاگرتنێکی بێ پەکخستن (إثبات بلا تمثيل، وتنـزيهٌ بلا تعطيل)، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٞۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ﴾[1].

واتە : هیچ شتێک وەکو خوا نییە و خوایش بیسەر و بینەرە .

وە باوەڕبوون بە فریشتە نزیکەکان لە خوا و پاک و بێگەردیان لە هەموو ئەو کەموکوڕییانەی کە بەسەر مرۆڤەکاندا دێن بۆ روونکردووەتەوە، وە فریشتەکان بەندەی ڕێزلێگیراون،وە ﴿لَّا يَعۡصُونَ ٱللَّهَ مَآ أَمَرَهُمۡ وَيَفۡعَلُونَ مَا يُؤۡمَرُونَ﴾[2]. واتە: فریشتەکان سەرپێچی خوا ناکەن لەوەی کە فەرمانیان پێدەکات و ئەوەیش ئەنجامدەدەن کە فەرمانیان پێدەکرێت ئەنجامی بدەن .

وە فریشتەکان: ﴿يُسَبِّحُونَ ٱلَّيۡلَ وَٱلنَّهَارَ لَا يَفۡتُرُونَ﴾[3].

واتە: بە شەو و بە ڕۆژ بەردەوام تەسبیحاتی خوا دەکەن بە بێدابڕان .

وە باوەڕبوون بە کتێبەکانی خوای گەورە کە دایانبەزاندووەتە سەر پێغەمبەرانی بۆ روونکردووەتەوە کە بریتین لە: زەبور و تەورات و ئینجیل و قورئان و پەڕاوەکانی ئیبراهیم ، بەڵام قورئانی پیرۆز لە هەموویان باشترە و گشتگیرترە، وە زاڵ و بڕیاردەرە بەسەر هەموویانەوە، حەق و ڕاستی یەکلا دەکاتەوە وباتڵ

(1) سورەتی الشورى: **11** .

(2) سورەتی التحريم: **6** .

(3) سورەتی الأنبياء: **20** .

ونارەوایش هەڵدەوەشێنێتەوە وپوچەڵی دەکاتەوە، خوای گەورە فەرموویەتی:﴿وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ بِٱلْحَقِّ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ ٱلْكِتَٰبِ وَمُهَيْمِنًا عَلَيْهِ﴾[1].

واتە: ئێمە قورئانمان دابەزاندووە بۆ تۆ بە حەق و ئەو کتێبانەی پێش خۆی بەراست دەخاتەوە و هەموو ئەو بەرژەوەندیانەشی تێدایە کەوا لە کتێبەکانی پێشوودا هەبووە و زاڵ و بڕیاردەریشە بەسەر هەموویاندا .

هەروەها باوەڕبوون بە پێغەمبەرانی خوا کە خوای گەورە هەڵیبژاردوون بۆ ڕێنمایی کردن و هیدایەتدانی مرۆڤایەتی، باوەڕمان بە هەر هەموویان هەیە و جیاوازی ناکەین لە نێوانیان، وە پێغەمبەران جیاوازن و لە فەزڵ وچاکێتیدا لە یەک ئاستدا نین، بەڵام باشترینیان و سەروەریان و کۆتایی پێهێنەریان موحەممەدە ﷺ، باوەڕبوون پێی باوەڕبوونە بە هەموو پێغەمبەران، وە بێباوەڕبوون پێی بێباوەڕبوونە بە هەموو پێغەمبەران، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ءَامَنَ ٱلرَّسُولُ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيْهِ مِن رَّبِّهِۦ وَٱلْمُؤْمِنُونَ ۚ كُلٌّ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ وَكُتُبِهِۦ وَرُسُلِهِۦ لَا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِّن رُّسُلِهِۦ ۚ﴾[2].

واتە: پێغەمبەری خوا باوەڕی هێنا بەوەی کە لە لایەن پەروەردگاریەوە دابەزیوەتە سەری و هەروەها ئیماندارانیش، هەموویان باوەڕیان هێناوە بە خوا و فریشتەکانی و کتێبەکانی و پێغەمبەرانی و جیاوازی ناکەین لە نێوان هیچ یەکێک لە پێغەمبەرانی .

هەروەها باوەڕبوون بە قەزا و قەدەری خوای گەورە، وە بەوەی کە هەر شتێک خوا بیەوێت ببێت دەبێت و ئەوەیش کە خوا نەیەوێت ببێت نـابێت، وە باوەڕبوون بەوەی کە هەر شتێک لەم بوونەوەرەدا روودات ئەوە بە پێی ویستی گەردوونی خوایە و گونجاوە لەگەڵ ئەوەیش کە لە (پەڕاوی پارێزراو / اللوح المحفوظ)دا تۆمارکراوە و هەر لە ئەزەلەوە بڕیاری لەسەر دراوە ، هیچ شتێک

(1) سورەتی المائدة: **48** .

(2) سورەتی البقرة: **285**

لەوە بەدەر نابێت نە لە ڕووداوەکانی گەردوون و نە لە هەڵسوکەوتەکانی مرۆڤیش.

وە باوەڕبوون بەوەیش کە خوای گەورە ویستی داوە بە بەندە کە بە ویستی خۆی ئەوە هەڵبژێرێت کە دەیەوێت، جا ئەگەر خێر و چاکەی هەڵبژارد ئەوا پاداشتی خێری لەسەر دەدرێتەوە، وە ئەگەر شەڕ وخراپەیشی هەڵبژارد ئەوا سزادەدرێت لەسەری، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَمَن يَعۡمَلۡ مِثۡقَالَ ذَرَّةٍ خَيۡرٗا يَرَهُۥ ۝٧ وَمَن يَعۡمَلۡ مِثۡقَالَ ذَرَّةٖ شَرّٗا يَرَهُۥ﴾[1].

واتە : هەرکەسێک بە کێشی مێروولەیەکی بچوک خێر و چاکە بکات ئەوا لە قیامەتدا دەیبینێتەوە وە هەرکەسێک بە کێشی مێروولەیەکی بچوک شەڕ و خراپە بکات ئەوا لە قیامەتدا دەیبینێتەوە .

هەروەها فەرموویەتی: ﴿قَدۡ أَفۡلَحَ مَن زَكَّىٰهَا ۝٩ وَقَدۡ خَابَ مَن دَسَّىٰهَا﴾[2].

واتە: ئەو کەسەی کە ناخ و دەروون و نەفسی خۆی پاک دەکاتەوە لە ویستی خراپە و تاوان سەرفراز و سەرکەوتوو دەبێت وە ئەو کەسەیش کە دەیشارێتەوە لە خۆپاک و خاوێن کردنەوە و خۆی گومڕا دەکات ئەوا دۆڕاو و زەرەرمەند دەبێت .

وە عەبد باوەڕی بەوە هەبێت کە ژیانی بەردەوام نییە لەم دونیایەدا، بەڵکو لێیەوە دەگوێزرێتەوە بۆ ناو گۆڕ، دوای ئەوەیش یان خۆشگوزرانییە یان سزا، وە دوای ئەوەیش زیندووبوونەوە ودەرچوونەدەرەوەیە لە گۆڕەکا، وە وەرگرتنەوەی نامەی کردەوەکان وکێشانە کردنی کردووەکان، لەو کاتەدا ئیمانداران فەزڵی خوایان بەردەکەوێت لە ناو باخەکانی خۆشگوزرانی بەهەشتدا، وە کافر وبێباوەڕانیش سزای بە ئێش وئازاریان بەردەکەوێت، خوای گەورە فەرموویەتی:﴿وَأُزۡلِفَتِ ٱلۡجَنَّةُ لِلۡمُتَّقِينَ ۝٩٠ وَبُرِّزَتِ ٱلۡجَحِيمُ لِلۡغَاوِينَ﴾[3].

---

(**1**) سورەتی الزلزلة: **7**و**8**

(**2**) سورەتی الشمس: **9**و**10**

(**3**) سورەتی الشعراء: **90**و**91**

واتە: وە بەهەشت نزیک کراوەتەوە بۆ کەسانی لەخواترس و خۆپارێز لە تاوانەکان، وە دۆزەخیش دەردەخرێت وبەرز دەکرێتەوە بۆ کەسانی گومڕا وسەرلێشێواو .

وە خوای گەورە ئەوەی بۆ بەندەکانی روونکردووەتەوە کە پێی لە خوا نزیک دەبنەوە و پەیوەندیان پێیەوە بە هێز دەکات، بۆیە چەندین جۆر پەرستنی بۆ داناون لە: نوێژ وزەکات ورۆژوو وحەج وزیکرەکان وجگە لەوانەیش، بۆ ئەوەی بەندە پەیوەندی بەردەوام بێت بە خواوە، بە مەبەستی ئەوەی دەروونێکی ئاسوودە وژیانێکی پڕ خێر وخاوێن کردنەوەی نەفس وبەختەوەی دونیا وسەرکەوتن ورزگاربوونی دواڕۆژ بەدەست بێنێت .

* ئەو بنەمایانەی کە خێزانی لەسەر ڕادەوەستێت لە ئیسلامدا:

ئیسلام ئەو بنەمایانـەی کە خێزانـی لەسەر ڕادەوەستێت بۆ تێکڕای ئوممەتی روونکردووەتەوە، وە خێزان خانەی یەکەمە بۆ بنیاتنانی کۆمەڵگا، وە بە یەکەوەگرێدانی نێوان ژن و مێردی روونکردووەتەوە بە زەواجـی شەرعی، وە ئەو حەق و مافانەش کە بۆ هەر یەکێـک لـە ژن ومێرد هەیە و ئەو ئەرکانەیش کە لەسەریەتی روونکردووەتەوە، وە بانگیانی کردووە بۆ پەروەردەکردنی منداڵان لەسەر پەروەردەیەکی ئیمانی، بۆ دەرهێنان وبەرهەمهێنانی نەوەیەکی صالح لە خوودی خۆیدا وبەسوودیش بێت بۆ ئوممەتەکەی، کە تاکەکانی خشتی چاک بن بۆ بنیاتنانی کۆمەڵگایەکی چاک .

وە ئاینی ئیسلام حەق ومافـی باوکانی لە چاکە کردن لەگەڵیاندا روونکردووەتەوە، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَلَا تُشۡرِكُواْ بِهِۦ شَيۡـٔٗاۖ وَبِٱلۡوَٰلِدَيۡنِ إِحۡسَٰنٗا﴾[1].

واتە: بە تەنها خوا بپەرستن و هیچ شتێک مەکەن بە شەریکی و چاکە بکەن لەگەڵ هەردوو باوک و دایکدا .

هەروەها حەق ومافـی منداڵانیش لە پەروەردەکردن ورێنمایی کردن روونکردووەتەوە، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ قُوٓاْ

(1) سورەتی النساء: 39

﴿... أَنفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ نَارًا﴾[1]. واته: ئەی ئەو کەسانەی کە باوەڕتان هێناوە خۆتان و خێزان و کەسوکارتان بپارێزن لە ئاگری دۆزەخ .

هەروەها حەق ومافی خزمانیشی لە گەیاندنی پەیوەندی خزمایەتی ودۆستایەتی وخۆشەویستی روونکردووەتەوە، بۆ ئەوەی خێزان ببێتە خێزانێکی بە هێز و یەکگرتووی دوور لە لەیەکترازان و پەرتەوازە بوون .

* بنەماکانی پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکان لە ئیسلامدا:

ئەی موسڵمانان: هەروەها ئاینی ئیسلام بنەماکانی پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکانیشی روونکردووەتەوە، وە ئەمەیش لەسەر ئیمان وبرایەتی ئیمانی بنیاتنراوە، خوای گەورە فەرموویەتی :

﴿إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ﴾[2].

واتە : تەنها ئیمانداران برای یەکن .

وە بانگی ئیماندارانیشی کردووە بۆ سەرخستنی یەکتر ویەکخستنی نێوانیان، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((مَثَلُ الْمُؤْمِنِينَ فِي تَوَادِّهِمْ وَتَرَاحُمِهِمْ وَتَعَاطُفِهِمْ مَثَلُ الْجَسَدِ إِذَا اشْتَكَى مِنْهُ عُضْوٌ تَدَاعَى لَهُ سَائِرُ الْجَسَدِ بِالسَّهَرِ وَالْحُمَّى)) [3].

واتە: نموونەی ئیمانداران لە دۆستایەتی و بە بەزەیی بوون وخۆشەویستیان بۆ یەکتر وەک نموونەی لەشێک وایە، ئەگەر ئەندامێکی ئێش و ئازاری هەبێت ئەوا هەموو ئەو لەشە لە پێناویدا بێ خەو دەبێت وتــا دەیگرێت .

وە هانیشیداون بۆ ئەوەی کە هەر یەکێکیان کەرامەت و حورمەت و ڕێزی براکەی بپارێزێت، وە خۆی بە دوور بگرێت لە سووکایەتی پێکردنی، وە هەوڵی یارمەتیدانی بدات، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : ((الْمُسْلِمُ أَخُو الْمُسْلِمِ لاَ

(1) سورەتی التحريم: **6**

(2) سورەتی الحجرات: **10**

(3) رواه مسلم في صحيحه : (4 / 1999) ح : (2585) .

يَظْلِمُهُ وَلاَ يُسْلِمُهُ، وَمَنْ كَانَ فِي حَاجَةِ أَخِيهِ كَانَ اللَّهُ فِي حَاجَتِهِ، وَمَنْ فَرَّجَ عَنْ مُسْلِمٍ كُرْبَةً فَرَّجَ اللَّهُ عَنْهُ كُرْبَةً مِنْ كُرُبَاتِ يَوْمِ الْقِيَامَةِ))[2].

واته: موسڵمان برای موسڵمانە، ستەمی لێ ناكات و نایفەوتێنێت ونایدات بە دەستی دوژمنەوە، وە هەر كەسێک كار بۆ بە جێهێنانی پێویستی برایەكی بكات ئەوا خوا كار بۆ بە جێهێنانی پێویستیی دەكات، وە هەر كەسێک ناڕەحەتیەک لەسەر موسڵمانێک لا بەرێت و لە تەنگانەیەک دەری بكات ئەوا خوا یەكێک لە ناڕەحەتی و تەنگانەكانی ڕۆژی قیامەتی لەسەر لادەبات .

هەروەها بنەماكانی مامەڵە بازرگانی و ماڵیەكانیشی ڕوونكردووەتەوە، بەوەی كە گرێبەستە حەڵاڵ و حەرامەكانی بۆیان ڕوونكردووەتەوە، وە كڕین و فرۆشتنی بۆ حەڵاڵ كردوون و ریبایشی لەسەر حەرام كردوون، وە فەرمانیشی پێكردوون بە بەوەفابوون بە گرێبەستەكان و دانەوەی ئەمانەت، خوای گەورە فەرموویەتی ﴿ٱلَّذِينَ يَأۡكُلُونَ ٱلرِّبَوٰاْ لَا يَقُومُونَ إِلَّا كَمَا يَقُومُ ٱلَّذِي يَتَخَبَّطُهُ ٱلشَّيۡطَٰنُ مِنَ ٱلۡمَسِّۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ قَالُوٓاْ إِنَّمَا ٱلۡبَيۡعُ مِثۡلُ ٱلرِّبَوٰاْۗ وَأَحَلَّ ٱللَّهُ ٱلۡبَيۡعَ وَحَرَّمَ ٱلرِّبَوٰاْۚ فَمَن جَآءَهُۥ مَوۡعِظَةٞ مِّن رَّبِّهِۦ فَٱنتَهَىٰ فَلَهُۥ مَا سَلَفَ وَأَمۡرُهُۥٓ إِلَى ٱللَّهِۖ وَمَنۡ عَادَ فَأُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ﴾[1].

واتە: ئەوانەی كە ریبا دەخۆن لە ڕۆژی قیامەتدا هەڵناسنەوە ئیللا وەكو ئەو كەسە نەبێت كە شەیتان و جنۆكە تێكەڵی لەشی بووە و دەستی لێوەشاندووە، ئەوەیش بە هۆی ئەوەوە كە وتویانە: "كڕین و فرۆشتن وەكو ریبایە"، بەڵام خوا كڕین وفرۆشتنی حەڵاڵ كردووە وریبایشی حەرام كردووە، جا هەركەسێک لە پەروەردگاریەوە ئامۆژگاری بۆ هات ووازی هێنا ئەوا ئەوەی پێشووی بۆ هەیە و دەرئەنجامیشی بۆ لای خوایە، وە هەركەسێكیش بگەڕێتەوە سەر ئەو تاوانە ئەوا ئەوانە لە خەڵكانی ئاگری دۆزخن و بە هەتاهەتایی تێیدا دەمێننەوە .

---

(2) رواه البخـاري في صـحيحه : (1 / 1126) ح : (2441) ومسـلم في صـحيحه (4 / 1996) ح : (2580) .

(1) سورەتی البقرة: **275**

وه فەرمانی پێکردوون بە ڕاستگۆیی لە کڕین وفرۆشتندا، وە ڕێگری لێکردوون لە غەش کردن و شاردنەوەی عەیبە وکەموکوڕیەکان وفریودان ونەزانی بە شتەکان و هەڵخەڵەتاندن .

وە حەڵاڵ وحەرامی خواردەمەنی وخواردنەوەکانیشی بۆیان روونکردووەتەوە، بەوەی کە شتە پاکەکانی بۆ حەڵاڵ کردوون بۆ ئەوەی بخۆن و بخۆنەوە بە بێ زیادەڕەووی وبەفیڕۆدان، وە مردارۆبوو و گۆشتی بەراز و شتە سەرخۆشکەر وهۆشبەرەکان وهەموو ئەو شتانەیش کە هەڕەشەن بۆ تەندروستی مرۆڤ لەسەر حەرام کردوون .

وە ڕێنمایی کردوون بۆ ڕەوشتە پیرۆزەکان وداب ونەریتە باشەکان، بۆیە فەرمانی پێکردوون بە ڕاستگۆیی ونیازپاکی ودڵسۆزی وچاکە کردن ودادوەری وچاوپۆشی لێکردن وپشوودرێژی وبەخشندەیی وسەخاوەیەتی، وە ڕێگری لێکردوون لە ڕەوشت وخووە خراپ وزەمکراوەکان لە غەیبەت کردن وقسەهێنان وبردن وپێرابواردن وگاڵتەپێکردن و گومانی خراپ بردن بە موسڵمانان .

وە کارە خراپ وبەدەکانی لەسەر حەرام کردوون بە بچوک وگەورەیانەوە، هەروەها هەموو ئەوانەیش کە سەردەکێشن بۆی، هەر بۆیە زینا و داوێن پیسی و ئەوەیش کە مرۆڤ نزیک دەکاتەوە لێی حەرام کردووە، لە: بە تەنها مانەوەی پیاو لەگەڵ ئافرەتی بێگانە ونامەحرەمدا، یان سەفەرکردنی ئافرەت بە بێ مەحرەم، یان پەیوەندیەکی جنسی و ئارەزوو وورووژێنەر کە پێچەوانەی شەرع بێت، هەروەها دزی کردن و کوشتن ودەستدرێژی و ستەم کردن لە خەڵک لە بوارەکانی خوێنیان و ماڵ وسامانیان و شەرەف و ناموسیان لەسەر حەرام کردوون، خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿قُلْ إِنَّمَا حَرَّمَ رَبِّيَ ٱلْفَوَاحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ﴾[1].

واتە : ئەی پێغەمبەر بڵێ : بەڕاستی پەروەردگارم کارە خراپ و بەدەکانی حەرام کردووە ئەوەی کە دەرکەوتەوە و ئاشکرایە و ئەوەشی کە نادیار وشاراوەیە .

(1) سورەتی الأعراف: **33**

وە سزا شەرعیەکانیشی بۆ داناون بۆ ئەوانەی کە ڕێگای تاوان دەگرنەبەر وسنورەکان دەبەزێنن و بە حەرامەکانەوە تێوەئەگلێن، بۆ ئەوەی ئەو سزایانە ڕاچەڵەکێنەر بێت بۆ ئەوانەی کە دەکەونە ناو ئەو تاوانانەوە، وە پەندیش بێت بۆ ئەوانەی کە تێیناکەون، هەر بۆیە تۆڵەکردنەوەی بە کوشتن داناوە لەبەرامبەر کوشتنی بە ئەنقەستی دەستدرێژکارانە، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَلَكُمْ فِي ٱلْقِصَاصِ حَيَوٰةٌ يَـٰٓأُو۟لِى ٱلْأَلْبَـٰبِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ﴾[1]. واتە: لە تۆڵەکردنەوە بە کوشتنی کەسی بکوژ ژیانتانی پێپارێزراو دەبێت ئەی ئەو کەسانەی کە خاوەن دڵ و ژیرین بۆ ئەوەی لەخوابترسن و خۆپارێزی بکەن لە تاوان .

وە سزای زینا و داوێن پیسی دیاری کردووە بە ڕەجم کردن و بەردباران کردن بۆ کەسانی خێزانهێنەر و شووکردوو، وە بە جەڵدە و شەلاق لێدان وشاربەدەر کردن بۆ کەسانی ژن نەهاوردوو و کچانی شوونەکردوو، وە سزای دیاری کراوی دزی کردن، وە سزای دیاری کراوی تۆمەتبار کردنی کەسانی تر بە زیناکردن، وە سزای دیاری کراوی مەشروب و مەی خواردنەوە، وە سزای دیاری کراوی کەسانی دەرچوو لە موسڵمانان ودەسەڵاتدارن، وە سزای دیاری کراوی جەردە و ڕێگرد و چەتە .

وە ڕێنمایی کردووە بۆ دادوەری و بە ویژدان بوون لە وەرگرتنەوەی حەق ومافەکان، وە دانەوەی حەق ومافەکان بۆ خاوەنەکانیان، وە ڕێگری کردووە لە ستەم کردن لە دادوەری وبڕیاردان و قەزاوەتی کردن ولادانەوە بە لای یەکێک لە خاوەن کێشەکان لەبەر خزمایەتی یان جگە لەوە، خوای گەورە فەرموویەتی:

﴿يَـٰدَاوُۥدُ إِنَّا جَعَلْنَـٰكَ خَلِيفَةً فِى ٱلْأَرْضِ فَٱحْكُم بَيْنَ ٱلنَّاسِ بِٱلْحَقِّ وَلَا تَتَّبِعِ ٱلْهَوَىٰ فَيُضِلَّكَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَضِلُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌۢ بِمَا نَسُوا۟ يَوْمَ ٱلْحِسَابِ﴾[2].

واتە: ئەی داود ئێمە تۆمان نیشتەجێ کردووە لە زەویدا بۆیە لە نێوان خەڵکدا دادوەری بکە و بڕیار بدە بەوەی کە حەقە و شوێنی هەوا وئارەزوو نەکەوێت

(1) سورەتی البقرة: **179**

(2) سورەتی ص: **26**

چونکە ئەوە گومڕات دەکات لە ڕێگای خوا، بەڕاستی ئەوانەی کە لە ڕێگای خوا لادەدەن و گومڕا دەبن سزایەکی توونیدیان بۆ هەیە بە هۆی ئەوەی کە ڕۆژی لێپرسینەوەیان لەبیرکردووە .

هەروەها ئاینی ئیسلام ئەوەیشی روونکردووەتەوە کە بەڕیەوەبردن وسەرپەرشتی کردنی کاروباری وڵات لە نێوان موسڵماناندا بنیاتنراوە لەسەر عەقیدە وبیروباوەڕی ئیسلامەتی نەک لەسەر هاوڵاتی بوون وعەشیرەت و ڕەگەز .

هەروەها حەق ومافەکانی فەرمانڕەوا وکاربەدەستانیشی بەسەر هاوڵاتیانی ژێر دەسەڵاتیەوە روونکردووەتەوە لە پێویست بوون و واجبێتی گوێڕایەڵی کردنی کاربەدەست لەوەی کە فەرمانی پێدەکات و قەدەغەی دەکات بە مەرجێک کە فەرمان بە تاوان وسەرپێچی شەرع نەکات وڕێگری لە خێر و چاکە نەکات، وە ئاینی ئیسلام هانی موسڵمانانی داوە بۆ کێشمانکێش نەکردنی فەرمانڕەوا وکاربەدەست وڕووبەڕوو نەبوونەوەی، وە ڕێنمایی کردوون بۆ وەستان لەگەڵیدا لەوەی کە توانا ودەستکەوتەکانی ئوممەتی پێدەپارێزرێت .

وە هانی فەرمانڕەوا و کاربەدەستیشی داوە بۆ دادگەری لە نێو هاوڵاتیانی ژێر دەسەڵاتیدا، وە بۆ بەدیهێنانی ژیانێکی ڕێزدارانە بۆیان، وە هانیشی داون بۆ نەرمونیانی وبەزەیی پێداهاتنەوەیان ودادگەری لە نێوانیاندا، وە ستەم نەکردن لێیان وناشبێت چاوپۆشی بکات لە هەندێکیان لە بەرژەوەندی هەندێکی تریان .

وە هانیشی داون بۆ هاوکاری کردنی یەکتر ویەکخستنی نێوانیان ووریاشی کردوونەتەوە لە ناکۆکی وجیاوازی، وە فارمانی پێکردوون بە یەک دەنگی ویەک وتەییان، خوای گەورە فەرموویەتی:﴿وَٱعۡتَصِمُواْ بِحَبۡلِ ٱللَّهِ جَمِيعٗا وَلَا تَفَرَّقُواْۚ﴾(1).

واتە: ئێوە هەمووتان دەست بگرن بە دین و بەرنامەی خواوە، وە پارچەپارچە و پەرتەوازە مەبن .

(1) سورەتی ال عمران: **103**

هەروەها فەرموویەتی: ﴿وَلَا تَنَٰزَعُواْ فَتَفۡشَلُواْ وَتَذۡهَبَ رِيحُكُمۡۖ﴾[1]. واتە: با ناکۆکـی و جیاوازی نەکەوێتـە نێوانتانـەوە چونکە ئەمە دەبێتە هۆی شکست خواردنتان و ڕۆیشتن و نەمانی هێز و تواناتان .

هەروەها ئاینی ئیسلام فەرمانیشی کردووە بە موسڵمانان بە حوکمڕانی کردنی شەرع وگەڕانەوە بۆ پیادە و پەیڕەوکردنی لە هەموو بوارەکانی ژیانی تاکە کەسی و کۆمەڵایەتیشدا، بۆ ئەوەی ژیانی ئوممەت ژیانێکی بڕیار لەسەردارو بێت و بەڕیوە بچێت بە پێی ئەوەی کە خوا بۆی داناون لە ئەحکام و بڕیارە شەرعییەکانی وئەوەی کە بۆی داناون لە بنەما و ڕێکخەرە شەرعییەکان و ئەوەی کە بۆی دیاری کردوون لە مەشخەڵ و سنوورە شەرعییەکان و ئەوەی کە هانی بۆ داون لە ڕەوشت و چاکەکاریەکان .

وە ڕێنمایی کردوون بۆ بەرەوپێش بردن و هەستانەوەی ئوممەتی ئیسلام لە رووی زانستی و ئابووری و کشتوکاڵی و پیشەسازیەوە .

هەروەها ڕێنمایی کردوون بۆ گرتنەبەری هەموو هۆکارێک کە پێشکەوتن وسەرکەوتنی تێدا بەرقەرار بێت، بە مەرجێک پێچەوانەی بنەما جێگیرەکانی ئیسلام نەبێت .

ئەمەیە شەرعی خوای گەورە، بەرنامەیەکی تەواو و تێر و تەسەلە بۆ ژیان، هاتووە بۆ بەختەوەرکردنی مرۆڤایەتی، وە بۆ ڕاگرتنی هاوتایی نێوان رۆح و مادە، وە بەیەکەوە گرێدانی نێوان عەقڵ و وەحیی، وە نێوان زانست و ئاین، وە نێوان عەقیدە و شەریعەت، وە نێوان عیبادەت وئابووری و ئەخلاق، وە نێوان دونیا و دواڕۆژ، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَٱبۡتَغِ فِيمَآ ءَاتَىٰكَ ٱللَّهُ ٱلدَّارَ ٱلۡأٓخِرَةَۖ وَلَا تَنسَ نَصِيبَكَ مِنَ ٱلدُّنۡيَاۖ﴾[2]. واتە: لەوەی کە خوا پێی داویت با مەبەستت تێیدا ماڵی دواڕۆژ بێت و بۆ قیامەت بەکاری بێنە و لەگەڵ ئەوەیشدا پشک وبەشی خۆتیش لە دونیا لە بیر مەکە .

* تایبەتمەندیەکانی کۆمەڵگەی ئیسلامی:

(1) سورەتی الأنفال: **46**

(2) سورەتی القصص: **77**

موسڵمانان: بەڕاستی ئەم کۆمەڵگایە کە ئیسلام بنیاتیناوە لەسەر بەرنامەی خوایی چەند تایبەتمەندیەکی هەیە کە جیای دەکاتەوە لە هەموو ئەو کۆمەڵگایانەی کە دینداری ناکەن بە ئاینی ئیسلام :

١ ـ لە تایبەتمەندیەکانی ئەم کۆمەڵگایە: بەرپاکردنی ئەمن وئاسایش وئارامی تێدایە : ئەمەیش لەبەر هەبوونی ڕاچەڵەکێنەرێکی ئیمانی لە دڵی موسڵماندا کە ڕێگری لێدەکات لە ئەنجامدانی تاوان، چونکە ئاینی ئیسلام ڕێنمایی شوێنکەوتوانی دەکات بە حورمەتگرتنی خوێن وحورمەتگرتنی ماڵ و سامان و حورمەتگرتنی شەرەف و نامووس، بەڵام یاسا داهێنراوەکانی دەستی مرۆڤـ ئەگەر ئاسایش وئارامیش بەرقەرار بکات لە ناو کۆمەڵگایەکدا ئەوا هەر کاتێک تاکێک لێی دەرباز بوو ئەوا تاوان ئەنجامدەدات بە بێ هەبوونی چاودێر و کەسێک کە لێپرسینەوە بکات .

٢ ـ وە لە تایبەتمەندیەکانی ئەم کۆمەڵگایە: پاراستنی حەق ومافە گشتییەکان: هەر بۆیە حەق ومافەکانی باوکان لە چاکە لەگەڵ کردندا دەپارێزێت، هەروەها حەق ومافەکانی منداڵان لە پەروەردەکردن وڕێنمایی کردندا، هەروەها حەق ومافەکانی خزمان و کەسانی نزیک لە گەیاندنی پەیوەندی خزمایەتی ودۆستایەتی و خۆشەویستی، هەروەها حەق و مافەکانی کەسانی گەورە تەمەن لە ڕێزلێگرتن، هەروەها حەق ومافەکانی کەسانی تەمەن بچوک و یەتیم لە بەزەیی پێداهاتنەوە و سۆز بۆ دەربڕین، هەروەها حەق ومافەکانی ئافرەتان لە بایەخ پێدان وڕێزلێـگرتن، هەروەها حەق و مافەکانی دراوسێ لە مامەڵەی چاک و پاک لەگەڵدا کردندا، هەروەها حەق و مافەکانی جگە لە موسڵمانانیش لە کەسانی خاوەن پەیمان و ئەمان و مۆڵەت پێدراو لە لایەن موسڵمانانەوە، خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿وَلَا يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَـَٔانُ قَوْمٍ عَلَىٰٓ أَلَّا تَعْدِلُوا۟ ۚ ٱعْدِلُوا۟ هُوَ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَىٰ ۖ﴾[1].واتە: با ڕق لێبوونتان لە کەسانێک واتان لێنەکات و هەڵتان نەنات لەسەر ئەوەی کە دادوەر نەبن، بەڵکو دادوەر بن چونکە ئەوە نزیکترە لە تەقوا و لەخواترسانەوە .

٣ ـ هەروەها لە تایبەتمەندیەکانی: بەڕاستی ئەم کۆمەڵگایە دروشمەکانی ئاینی ئیسلامی تێدا دیار و ئاشکرایە : لە بانگدان و نوێژ و ڕۆژوو و زەکات وحەج

(**1**) سورەتی المائدة: **8**

وڕەوشتە ئیسلامییەکان، کە موسڵمان لە ژیانیدا هەموویان بە ئاشکرا پیادە دەکات، چونکە لە ئیسلامدا شتی شاراوە نییە، نە لە عەقیدە وبیروباوەڕەکانیدا و نە لە عیبادەت وپەرستنەکانیشیدا، بە پێچەوانەی مەزهەب وئاینە ڕووخێنەرەکان کە بیروباوەڕەکانیان وئەو بنەمایانەی کە لەسەری دەڕۆن دەشارنەوە وپێچەوانەی ئەوەی کە باوەڕیان پێی هەیە دەردەخەن .

٤ ـ هەروەها لە تایبەتمەندیەکانی ئەم کۆمەڵگایە: ئەوەیە کە ئەم کۆمەڵگایە کۆمەڵگایەکی بە ڕەوشتە: هەر بۆیە ئەوەی کە سووکە وڕیسوایە وەلای دەنات و بانگەشە دەکات بۆ شەرم و حەیا و پۆشتەیی ودەست و زمان و دامێن پاکی .

٥ ـ هەروەها لە تایبەتمەندیەکانی ئەم کۆمەڵگا موسڵمانە: ئەوەیە کە کۆمەڵگایەکی هاوکارە : تاکەکانی هاوکاری یەکتر دەکەن لەسەر کردنی چاکە و نەکردنی خراپە و تاوان، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَٱلۡمُؤۡمِنُونَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتُ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلِيَآءُ بَعۡضٖۚ يَأۡمُرُونَ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَيَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ﴾[1].

واتە: وە پیاوانی ئیماندار وئافرەتانی ئیماندار هەندێکیان دۆست وپشتیوانی هەندێکی تریانن، فەرمان دەکەن بە چاکە و ڕێگری دەکەن لە خراپە .

هەروەها فەرموویەتی : ﴿وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلۡحَقِّ وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلصَّبۡرِ﴾[2].

واتە: وە ئامۆژگاری یەکتر دەکەن بە شوێنکەوتنی حەق و ئامۆژگاری یەکتر دەکەن بە ێەبر و ئارام گرتن .

٦ ـ هەروەها لە تایبەتمەندیەکانی: بریتییە لە پەیوەست کردنی نێوان هەموو تاکەکانی بە پەیوەندی ئیمان: هەر بۆیە ئاینی ئیسلام برایەتی خستووتە نێوان موسڵمانانەوە بە جیاوازی ڕەنگ و ڕەگەز و عەشیرەت، وە بەم دینە کۆیانی کردووەتەوە، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِنَّمَا ٱلۡمُؤۡمِنُونَ إِخۡوَةٞ﴾[3]. واتە: بەڕاستی تەنها ئیمانداران برای یەکن .

---

(1) سورەتی التوبة: 71

(2) سورەتی العصر: 3

(3) سورەتی الحجرات: 10

٧ ـ هەروەها لە تایبەتمەندیەکانی: ئەوەیە کە ڕێزداری تێیدایە بە پێی لەخواتـرسان وچاکەکـاری وخۆپاراستنە لە تاوانەکـان، خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿إِنَّ أَكۡرَمَكُمۡ عِندَ ٱللَّهِ أَتۡقَىٰكُمۡۚ﴾[1]. واتە: بەڕاستی ڕێزدارترینتان لای خوا لەخواترسترینتانە .

واتە : کێ لە هەموان زیاتر لە خواترستر و چاکەکارتر و خۆپارێزتر بێت لە تاوانەکان ئەوا ئەو کەسە بەڕێزترینی نێو موسڵمانانە .

٨ ـ هەروەها لە تایبەتمەندیەکانی: بریتییە لە یەکگرتنی نێوان کاربەدەستان و هاوڵاتیانی ژێر دەسەڵاتیان: چونکە کاربەدەست و سەرپەرشتیار هەست بە کێشە و گرفتەکانی هاوڵاتیانی ژێر دەسەڵاتەکەی دەکات، وە هەوڵیش دەدات بۆ چارەسەرکردنی کێشە و گرفتەکانیان و تیمارکردنی برینەکانیان ویارمەتیدانی موحتاج ونەدارەکانیان، وە هاوڵاتیانیش لە بەرامبەر ئەوەدا خۆشەویستی دەردەبڕن بۆ کاربەدەست وسەرپەرشتیارەکەیان ودوعاکردن بۆی و وەستان لەگەڵیدا لە هەموو بار و حاڵەتەکاندا .

ئیسلام دەیەوێت کۆمەڵگای موسڵمان ئاوەها بێت .

٩ ـ هەروەها لە تایبەتمەندیەکانی ئەم کۆمەڵگـا موسڵمانە : ئەوەیە کە ئەم کۆمەڵگایە تێکڕای دامەزراوە شەرعی وزانستی ورۆشنبیری وئابووری ودادوەری و ئەمنیەکانی تەواوکەری یەکترن و هەر هەموویان لە خزمەتی پاراستنی ئەم ئاینەدان و پارێزگاری لە ناسنامەی ئەم کۆمەڵگایە دەکەن ودەیپارێزن لە شل و خاو بوونەوە و ڕۆژئاواگەری .

١٠ ـ هەروەها لە تایبەتمەندیەکانی ئەم کۆمەڵگایە: ئەوەیە کە ئەم کۆمەڵگایە کۆمەڵگایەکی خواییە: چونکە ئاینی ئیسلام بوارە گشتییەکانی ڕێک دەخات چ سیاسی و ڕامیاری بێت یاخود ئابووری، ژیانی کۆمەڵگا ملکەچە بۆ ئەم ئاینە، نەک بۆ هەواوئارەزوو و حەزەکانی خەڵک و ئەوەی کە ئارەزووی دەکەن و پێیان خۆشە .

١١ ـ هەروەها لە تایبەتمەندیەکانی ئەم کۆمەڵگایە: بەها مەعنەوی وئەخلاقیەکان تێیدا لە پێشترن لە بەرژەوەندییە مادیەکان: هەر بۆیە بەدیهێنانی بەرژەوەندییە

---

(**1**) سورەتی الحجرات: **13**

مادیەکان و بەدیهێنانی پێشکەوتنی زانستی لە ناو کۆمەڵگادا بەمەرج گیراوە بەوەی کە پێچەوانەی بنەما و بەها ورەوشتەکانی شەرع نەکات .

١٢ ـ هەروەها لە تایبەتمەندیەکانی ئەم کۆمەڵگایە : ئەوەیە کە ئەم کۆمەڵگایە کۆمەڵگایەکی ئاینی و مەدەنییە لە یەک کاتدا: چونکە لە ئیسلامدا جیاکردنەوە نییە لە نێوان دین و دونیا، هەر بۆیە ئیماندار نوێژ دەکات و ڕۆژوو دەگرێت و زەکات دەدات و حەج دەکات و زیکری خوا دەکات ئەمە لە کاتێکدا کە ئەو هەر لە ناو شوێنی بازرگانیەکەیدایە، یان لە ناو بنکەی تووێژینەوەکەیدایە، یان لە ناو فەرمانگەیەکی حکومیدایە، یان لە ناو دامەزراوەیەکی زانستی یان ئابووریدایە ، یان لە ناو پیشەیەکی پزیشکی یان کشتوکاڵیدایە ، یان جگە لەمانە لە بوارەکانی تری ژیان، ئاینەکەی بانگی دەکات بۆ ئەوە و هەروەها بۆ ئەوەیش کە ئیمانداریکی صاڵح بێت لە هەموو کردەوەکانیدا و هەڵبسێت بە ئەنجامدانی هەموو ئەو کارانەی کە داوای لێکراوە جێبەجێی بکات، موسڵمان ئاوەهایە .

* تەواوکاری کۆمەڵگەی موسڵمانان و ئەرکەکانی تاکەکانی:

ئەم تایبەتمەندی وجیاکەرەوەییانەی ئەم کۆمەڵگایە بەڕاستی کاتێک بە تەواوی بەدی دێت بە هەموو بەشەکانییەوە ئەگەر هەموو تاکێکی ئێمە ئەرکی ئاینی وبەرپرسیارێتی کۆمەڵایەتی وئەمانەتی پیشەیی خۆی بەجێبێنێت، بەوەی کە:

١ ـ باوک: ئەرکی خۆی بەجێبێنێت بەرامبەر بە منداڵەکانی لە رووی پەروەردەکردنیان و ڕێنمایی کردنیانەوە.

٢ ـ وە مامۆستایش: قوتابییەکانی فێربکات وخۆشەویستی خێریان تێدا بچێنێت و زانستە بەسوودەکان و ڕێگای ڕاستیان فێربکات.

٣ ـ وە موفتییەکان وپیاوانی شەرعزانیش: فەتوا بۆ خەڵک بدەن لە بوارەکانی ئاینەکەیان، وە کێشەکانیان بۆ چارەسەر بکەن، وە وەڵامی گرفت وپێشهاتەکانیان بدەنەوە بەوەی کە گونجاوە لەگەڵ قورئان وسوننەت و بنەما گشتییەکانی شەرع.

٤ ـ وە ئامۆژگاریکار و وتارخوێنی مزگەوتەکانیش: بانگەواز بکەن بۆ خێر وچاکە و لەخواترسان و خۆپاراستن لە تاوان، وە موسڵمانان وریا بکەنەوە لە خراپە، وە ئوممەتی ئیسلامیش ببەستنەوە بە سەرکردەکانیانەوە لە زانایان و سەرکردەکان.

٥ ـ وە کەسانی فەرمانکار بە چاکە و قەدەغەکاری خراپە و تاوان و پیاوانی چاودێر و بەرپرسی لێپرسینەوە: هەڵبسن بە ئەرکی خۆیان لە ڕێنمایی کردنی

کۆمەڵگا و چاک کردنی هەڵەکان و دەستگرتنی هەڵەکار و ڕێنمایی کردنی بە حیکمەت و دانایی و ئامۆژگاری چاکە و وتەی جوان بۆ ئەوەی دوور بکەوێتەوە لە شەڕ و خراپە بە قەناعەت و زانستەوە بەوەی کە فێری بکات ئەم کارە زەرەر و زیانی تێدایە بۆی.

٦ ـ وە ڕاگەیاندکارن و ڕۆژنامەنووسانیش: هەڵبسن بە ئەرکی خۆیان لە خزمەت کردنی ئاینەکەیان وپرسەکانی ئوممەتەکەیان، وە ئەوەیش بڵاوبکەنەوە کە خێر وچاکەی دین ودونیای خەڵکی تێدایە، لەگەڵ وابەستەبوون بە ڕاستگۆیی و ووردکاری لە گواستنەوەی ڕووداو وهەواڵەکاندا.

٧ ـ وە پیاوانی خاوەن پارە و سەرمایەداریش: لە ماڵ و سامانەکانیان ببەخشن لەو بوارانەدا کە چاکێتی و سوودی ئوممەتی تێدایە، وە پارە و ماڵەکانیان بخەنە بەر وەبەرهێنانەوە لەو بوارانەدا کە خێری ئوممەتی تێدایە بۆ ئێستا و داهاتووی .

٨ ـ وە پیاوانی ئابووریناسیش: ئەرکیان ئەوەیە کە ئوممەت لە بواری ئابووریەوە بەرەو پێش ببەن و بواری ئابووری بە دوور بگرن لە ریبا .

هەروەها پیاوانی تریش: ئەرکیان ئەوەیە کە ئوممەت بەرەو پێش ببەن لە بوارەکانی زانستی و پیشەسازی و کشتوکاڵی و پزیشکیدا .

٩ ـ وە پیاوانی سیاسەتمەداریش: هەڵبسن بە بەڕیەوەبردنی کۆمەڵگای موسڵمانان بەو شێوازەی کە نزیکتر بن لە حەق و چاکسازیەوە، وە لە بواری پەیوەندیەکانی دەرەوەیشدا پەیوەندیەکی دۆستانە بەرقەرار بکەن لەگەڵ وڵاتی جیهاندا، وە لەگەڵیاندا هاوکار بن لەوەدا کە بەختەوەری ئوممەتی تێدایە و شەڕ و بەڵای لێدوور دەخاتەوە .

١٠ ـ وە پیاوانی ئەمن و ئاسایشیش: هەڵبسن بە ئەرکی خۆیان لە پاراستنی ئەمن ودەستگرتنی کەسانی تاوانبار وتێکدەر و یاریکەر بە ئەمن وئاسایشی ئوممەت، وە هەڵبسن بە پاراستنی سەر سنوورەکان .

١١ ـ وە پیاوانی دادگایش: بنەماکانی دادوەری و ویژدان بەرقەرار دەکەن بۆ گەیاندنی حەق و مافەکان بە خاوەنەکانیان .

١٢ ـ وە ئەوانەیش کە کاروباری وڵات بەڕێوەدەبەن: ئەو بڕگە و بڕیارانە دابنێن کە گونجاوە و لەگەڵ شەرعی خوادا دەگونجێت و لەگەڵ هیچ شتێک لە ڕێنماییەکانی ئیسلامدا جیاواز و پێچەوانەوە نەبێت .

١٣ ـ وە فەرمانبەرانیش لە ناو فەرمانگە حکومیەکاندا: ئەرکە فەرمانبەری وپیشەییەکانی خۆیان بەجێبێنن بە ڕاستگۆیی وئەمانەتەوە، لەگەڵ دوور بوون لە مننەت کردن و وەرگرتنی ڕەشوە و بەرتیل.

١٤ ـ وە پیاوی دیبلۆماسی موسڵمانیش: هەڵبسێت بە نوێنەرایەتی کردنێکی ڕاستەقینەی وڵاتەکەی، وە پەیامێکی ڕاستگۆیانە سەبارەت بە ئاین و ئوممەتەکەی هەڵبگرێت، وە خۆی بڕازێنێتەوە بە ئەخلاق وڕەوشتە چاکەکان، وە بەرگری بکات بە پرسەکانی ئاین و ئوممەتەکەی.

* ئەو ئاستەنگانەی کە ئێستا ڕووبەڕووی جیهانی ئیسلامی بووەتەوە:

ئەی ئوممەتی ئیسلام: ئەمڕۆ جیهانی ئیسلامی بە مەترسیدارترین قۆناغەکانی ژیانیدا تێدەپەڕێت، وە ڕووبەڕووی بارودۆخ وچەندین ئاستەنگی ناڕەحەت وگران بووەتەوە، وە گرفتاریشە بە دەست دابەشبوون ولێکترازانی نەوەکانی وناکۆکی نێوانیانەوە، هەروەها بە دەست هێرشێکی دڕندانە ودەست تێوەردانێکی ئاشکرا لە کاروبارەکانیدا لە لایەن دوژمنانیەوە .

وە موسڵمان دڵگران دەبێت بەوەی کە دەیبینێت لەم هەرکەس بۆ خۆیی وفیتنە وئاشوبەی کە بووەتە هۆی نەمانی ئەمن وتێکچوونی بەڕێوەچوونی وڵات بە ڕێکوپێکی و هەڵخلیسکانی ژیانی ڕۆژانە وبەرژەوەندیەکانی ئوممەت، وە ئەوەی کە بەدیهاتووە لە وێران بوونی وڵات و بە تاڵان بردنی ماڵ و سامانی گشتی و ڕشتنی خوێنی کەسانی بێتاوان، تا ئەو ئاستەی کە خەڵک وازیان هێناوە لە ماڵ وشوێنی نیشتەجێبوون و وڵاتی خۆیان وڕایان کردووە و لێی هەڵهاتوون لە دەست ئەو فیتنە وئاشووب وکارەساتانە .

وە ئەمەیش جێیخەوتنی هەموو موسڵمانێکی شڵژاندووە کە لە دڵیدا غیرەتی هەڵگرتبێت لەسەر ئاین وبیروباوەڕەکەی و بەزەیی بێتەوە بە ئوممەتەکەی و ئەو هەموو خوێنەی کە بە ناحەق و ناڕەوا دەڕێژرێت .

* چەند وەستانێک بۆ دەربازبوون لە ئەو گرفت و ئاستەنگانە:

وە ئێمە لەگەڵ ئەم ڕووداوە ئازاربەخش وغەمگینانەدا چەند وەستانێکمان هەیە کە مەشخەڵەکانی دەربازبوونی لە ئەم گرفتانە وێنا کردووە و دەبنە هۆی زاڵبوون بەسەر ئەو ئاستەنگە گەورانەدا:

١ ـ بە لای موسڵمانەوە شارەوە نییە کە نهێنی توانا و هێز و ڕاگری ئەمن وئارامی ئوممەتی ئیسلامی بریتییە لە: دەست گرتنی بە کتێبەکەی پەروەردگاری

و سوننەتی پێغەمبەرەکەیەوە ﷺ، جا هەرچەندێک ئوممەتی ئیسلام دەست بگرێت بە ئاینی پەروەردگاریەوە ئەوا هەندە بە هێز و باڵادەست و جێگیر و کۆمەڵبەند دەبێت و دوژمنانی لێی دەترسن وحیسابی بۆ دەکەن، وە هەرچەندێکیش دەستبەرداری ئاینەکەی بێت ورۆبچێتە ناو شەهوەت وئارەزووەکانەوە ئەوا هەندە پێگەی بێهێز و لاواز دەبێت و نەوەکانی دابەش دەبن و لە پێش چاوی دوژمنانی سووک دەبێت و لە هەموو لایەکەوە لەسەری کۆدەبنەوە .

٢ - بەڕاستی ئیسلام کاولکاری وتیرۆر وتێکدانی ئەمن وئاسایش ڕەتدەکاتەوە، وە خوێن ڕشتن و بە تاڵان بردنی ماڵ وسامان ودەستدرێژی کردنە سەر نامووس حەرام و قەدەغە دەکات.

٣ - بەڕاستی ئیسلام چارەسەرە بۆ هەموو کێشە و گرفتەکانی ئوممەتی ئیسلام، وە بەدیهاتنی کارە چاوتێبڕاوەکانی نەوەکانی تێدایە لە بەرقەرار کردنی کۆمەڵگایەک کە دادوەری سەروەری بێت ودەرفەتەکانی ژیانی ڕێزدارانەی تێدا هاوتابێت و هاوڵاتی بوونی دادوەرانەی تێدا بەدیبێت وحەق ومافەکانی هەموو تاکەکانی تێدا پارێزراو بێت .

٤ - بەڕاستی ئیسلام تەنها هەڵبژاردەیە بۆ تێکڕای میللەتانی ئیسلامی، جا هەر درووشمێکی نەفامی وجاهلی یان هەر بانگەوازێک بۆ پرۆگرامێک جگە لە پرۆگرامی ئیسلام ئەوە بانگەوازێکی پووچ و باتڵ و ڕەتکراوەیە.

٥ - پێویستە لەسەر موسڵمانان هەر هەموویان لە خوودی خۆیاندا لەخوابترسن، وە هەوڵی چارەسەرکردنی کێشەکانیان بدەن بە بێ دەست تێوەردانی دوژمنانیان، وە وریا و ئاگادار بن لە فیتنەی تایفی کە برایەتی موسڵمانانەی نێوانیان لەکەدار دەکات و لێی دەبات.

٦ - پێویستە لەسەر زانایانی ئوممەت کەوا هەستن بە ئەرکی سەرشانی هیواپێبراویان لە ڕێنمایی کردنی خەڵک، وە سووربن لەسەر پاراستنی کۆمەڵگای موسڵمان، وە پێشکەش کردنی پێشبینی وپرۆگرامی واقعیانە بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانی ئوممەت ودوور خستنەوەیان لە فیتنە وکارەساتەکان .

٧ - پێویستە لەسەر سەرکردەی میللەتانی ئیسلامی کەوا دادوەری بەرقەرار بکەن لە نێو میللەتەکانیان، وە بەرهەڵستی فەساد و گەندەڵی بکەن، وە بەرژەوەندیەکانی میللەتان بخەنە پێشەنگی کارە گرنگی و بایەخ پێدراوەکانیان .

٨ ـ وە پێویستیشە لەسەر هاوڵاتیان کەوا لە چواردەوری سەرکردەکانیان کۆببنەوە، وە هەوڵی چارەسەرکردنی کێشەکانیان بدەن بە ڕێگا سەلامەت و بێئۆینەکان، دوور لەم هەموو جەنگ و خوێن ڕێژی و وڵات وێران کردنانە .

* هێرشی ڕاگەیاندن وڕۆشنبیری:

ئەی ئوممەتی ئیسلام:

بەڕاستی لەوەی کە مایەی نیگرانێکی زۆرە ئەم هێرشی ڕاگەیاندنی وڕۆشنبیرییە ڕێکخراوەیە کە دەیەوێت عەقیدە وئیمان لە ناو دڵی تازەپێگەیشتوواندا لاواز بکات وئەخلاق ورەوشت شل وخاو بکاتەوە وکەسایەتییان لاواز بکات.

بەڕاستی ئەم هێرشە کاریگەری خراپی خۆیی لەسەر گەنجان وتازەپێگەیشتووان بەجێهێشتووە، هەر بۆیە کەسایەتی نـــاموسڵمانانە بووەتە جێی سەرسام بوون ولاسایی کردنەوە بە لای هەندێکیانەوە، لاسایی دەکەنەوە نەک تەنها لە شتە ڕواڵەتیەکاندا بەڵکو لە هەڵسوکەوت وشل وخاو بوونەی ئەخلاقی ووەلانانی شەرم وحەیا وبڵاوبوونەوەی بەدڕەوشتنی و کاری خراپیشدا.

ئەی موسڵمان: بەڕاستی ئەم هێرشە ڕێکخراوە پێویستە ڕووبەڕوو بکرێتەوە بە ڕاگەیاندنێکی باش کە بەر هەڵستی وبەربەرەکانێی ئەم هێرشە بکاتەوە بە چەندین کەناڵی ئیسلامی ودەستەیەک ڕاگەیاندکار سەرپەرشتی بکات کە نێوان زانستی شەرعی وتێگەیشتن لە واقع و پیشەی ڕاگەیاندکاریش کۆبکاتەوە بۆ گەیاندنی پەیامی ئیسلام بە هەمووان.

* جیهانگیری وناسنامەی ئیسلامەتی:

موسڵمانان: بەڕاستی ئێمە لە سەردەمی جیهانگیریدا دەژین کە تێیدا لایەنی بەهێز کلتووری خۆی دەسەپێنێت بەسەر لایەنی لاوازدا وهەوڵی سڕینەوەی ناسنامەی دەدات.

بۆیە پێویستە لەسەر موسڵمانان کە پارێزگاری بکەن لەسەر ناسنامەی موسڵمانانەی خۆیان،وە دامەزراوبن لەسەر شتە جێگیر ویەکلابووەکانیان لە عەقیدە وشەریعەت وئەخلاق ورەوشت، لەوەی کە قورئان وفەرموودە بەڵگەن لەسەری، هەموویان یەکسانن چ ئەوەی کە پەیوەندی هەبێت بە لایەنەکانی عەقیدە وبیروباوەڕەوە یان عیبادەت وپەرستنەوە یان حوکمڕانی شەریعەتەوە یان حەڵاڵ وحەرامەوە یان پرۆگرامی خێزان وبواری ئافرەتانەوە یان ڕەوشت

وبەهاکانەوە، پێویستە پارێزگاری لەسەر هەموویان بکەین پارێزگاریەکی گەورە، وە تەنازول نەکەین و دەستبەردار نەبین لە هیچ شتێکیان لەژێر هەر بارودۆخێک بێت لە بارودۆخەکان .

وە لەپێناو بەدیهاتنی ئەوەدا پێویستە پەیماننامەیەک لای موسڵمانان هەبێت کە تێیدا ڕێک بکەون لەسەر ئەو بنەمایانە کە جێی باوەڕیانە، بۆ ئەوەی ببێتە زەمینەیەکی لەبار بۆ مامەڵە کردنی گونجاو لەگەڵ ئوممەتان و ڕێکخراو وپەیماننامە نێودەوڵەتیەکان، بۆ هاوکاری کردن لەسەر خاڵە هاوبەشە بەسوودەکان، وە تێبینی هەبوون و خۆپاراستن لە ئەو خاڵانەی کە پێچەوانەی کارە جێگیر و بەهاکانی ئیسلامە.

* سەلەفییەت و مەشخەڵەکانی:

ئەی موسڵمان:

بەڕاستی تێگەیشتنی ڕاست ودروست بۆ ئیسلام بە شێوازە پرشنگدار وگشتگیرەکەی بریتییە لە سەلەفییەتی حەق کەوا صەحابەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ وشوێنکەوتوانیان بە چاکە لەسەری بوون، وە شوێنکەوتوانیان لە چوار پێشەواکە وئەوانەی دوای ئەوان لەسەری ڕۆیشتن.

وە ئەم سەلەفییەتە لە ئیسلامدا چەند مەشخەڵێکی هەیە:

١ ـ لە مەشخەڵەکانی: بەڕاستی سەلەفییەت ئەو ڕاستە ڕێباز وڕێگا ڕاستەیە کە فەرمانمان پێکراوە بە شوێنکەوتنی، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَأَنَّ هَٰذَا صِرَٰطِي مُسۡتَقِيمٗا فَٱتَّبِعُوهُۖ﴾[1].

واتە: ئەمە ڕێگای ڕاستی منە و بیگرنە بەر و شوێنی بکەون .

٢ ـ هەروەها لە مەشخەڵەکانی: بەڕاستی قورئان و سوننەت سەرچاوەی شەریعەتدانان و زانست و زانیارییە، وە بەڕاستی سەلەفییەت رووشاندنی قودسییەت و پیرۆزی قورئان و سوننەت یان لێکدانەوەی هەڵە و گۆڕینی واتاکانی بۆ ئەوەی کە لەگەڵ عەقڵی مرۆڤەکاندا بگونجێت ڕەتدەکاتەوە .

---

(1) سورەتی الأنعام: 153

٣ ـ هەروەها لە مەشخەڵەکانی سەلەفییەتی صالح: ئەوەیە کە بەڕاستی سەلەفییەت وا نابینێت هیچ کەسێک لە مرۆڤەکان پارێزراوە لە هەڵەکردن لە پاش پێغەمبەری خوا ﷺ جا ئەو کەسە گەیشتبێتە هەر پلەیەک لە دونیانەویستی و لەخواترسان و خۆپاراستن لەو شتانەی مەترسی زیان هەبوونیان لێدەکرێت لە ڕۆژی قیامەتدا، چونکە پارێزراوبوون لە هەڵەکردن تەنها تایبەتە بە (موحەممەدەوە) .

٤ ـ هەروەها لە مەشخەڵەکانی سەلەفییەت: بەڕاستی سەلەفییەت وا دەبینێت کە تەوحید و یەکخواپەرستی گرنگترینی شتەکانە، هەر بۆیە دەست پێکردن لە تەوحید و یەکخواپەرستیەوە لە پێویستترینی کارە پێویستەکانە، چونکە لەپێناو ئەمەدا خوای گەورە بوونەوەری دروست کردووە، وە لەپێناو ئەمەدا کتێبەکانی دابەزاندووە، وە لەپێناو ئەمەدا پێغەمبەرانی ناردووە، هەر بۆیە بە لای سەلەفییەتەوە شتی پڕوپووچ وخورافیات وئەفسانە و وابەستەبوون بە مەرقەد وجنۆکە وشەیتانەکان وجادووبازەکانەوە بوونیان نییە .

٥ ـ هەروەها لە مەشخەڵەکانی سەلەفییەتی صالح: بریتییە لە پشت بەستن بە تێگەشتنی صەحابە بۆ دەقەکانی قورئان و سوننەت، ئەمەیش لەبەر قووڵی زانستیان و وەرگرتنی ڕاستەوخۆیان لە پێغەمبەری خواوە ﷺ لەگەڵ سەلامەتی و پاکێتی فیترەت و پێکهاتە وناخیان و ڕاستێتی زمانیان .

٦ ـ هەروەها لە مەشخەڵەکانی سەلەفییەت: بریتییە لە تێگەیشتنێکی گشتگیر و هەمەلایەن بۆ ئیسلام، وە ئیسلام پرۆگرامێکی تەواو وتێروتەسەلە لە هەموو بوارەکانی بیروباوەڕ و پەرستن و شەرعدانان وبەهاکان و ئەخلاق و پرۆگرامە سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتیەکان، چونکە لە ئیسلامدا لێکترازان نییە لە نێوان ئەم بەش و بوارانەدا، بەڵکو هەندێکیان پەیوەستن بە هەندێکی تریانەوە .

* سەلەفییەت جموجوڵێکە نوێ دەبێتەوە و لەگەڵ پێشکەوتن وبابەتە نوێیەکانی سەردەمدا دەڕوات:

لەبەر ئەمە هەر کەسێک بۆچوونی وابێت و وادەربڕێت کەوا سەلەفییەت خاوەنی دید و تێڕوانینێکی روون نییە بۆ ژیان، وە خاوەنی مەنهەج وپرۆگرامێک نییە بۆ چاکسازی کۆمەڵگا، وە خاوەنی بەرنامەیەک نییە بۆ پێکهێنان و بەرقەرار کردنی دەوڵەت و کۆمەڵگایەک ئەوا ئەو کەسە لەم بۆچوونەیدا هەڵەی کردووە .

* چەند چەمک و تێگەیشتنێک کە پێویستە ڕاست بکرێنەوە:

موسڵمانان: هەندێک بانگەواز هەیە لە ناو هەندێک لە وڵاتانی ئیسلامیدا بانگەشە دەکەن بۆ ئازادی و دادوەری و یەکسانی لە ژێر دروشمی دیموکراسیەتدا!

ئێمەیش بە ئەوانە دەڵێین: بەڕاستی ئیسلام پێش ئەو بنەمایانە کەوتووە بە زیاتر لە چواردە سەدە لە زەمەن، وە لەسەر زەوی واقعیشدا پەیوەڕەوی کردوون لە ژیانی پێغەمبەری خوا ﷺ وجێنیشینە ژیروهۆشمەندەکانیشیدا، بەڵام تێگەیشتن وواتای ئەو چەمکانە لە ئیسلامدا بەو تێگەیشتن وواتایانە نییە کە لە پرۆگرامە دەستکردەکانی مرۆڤەکاندایە.

ئازادی لە ئیسلامدا: بریتییە لە ئازادکردنی بەندە لە بەندایەتی کردن وپەرستنی مرۆڤەکان و لە پەرستنی مەرقەد و گۆڕەکان و لە بەندایەتی هەواوئارەزوو و شەهوەتەکان بۆ ئەوەی ببێتە عەبد و بەندەیەکی صاڵح بۆ خوای پەروەردگار .

ئیسلام دان بە هیچ ئاینێکی تردا نانێت جگە لە ئاینی ئیسلام، وە یەکسانی ناکات لە نێوان حەق و باتڵ، وە لە نێوان چاکسازی و گەندەڵی، وە لە نێوان چاکە و خراپە، وە ئەوەی کە ناقوڵا و زۆر خراپە و دەرکەوتنی لەش و عەورەتی ئافرەتان و خۆڕازاندنەوەیان و رووتی و بەرەڵایی حەرام و قەدەغە دەکات .

وە ئیسلام بانگەواز دەکات بۆ دادوەری و خوای گەورە لە قورئاندا فەرمانی پێ کردووە، خوای گەورە فەرموویەتی ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُ بِٱلۡعَدۡلِ وَٱلۡإِحۡسَٰنِ﴾[1].

واتە: بەڕاستی خوا فەرمان دەکات بە دادپەروەری و چاکەکاری .

وە چەمکی دادوەری لە ئیسلامدا واتایەکی فراوانی هەیە، چونکە دادوەری لە مامەڵەکردنی بەندە لەگەڵ پەروەردگاریدا هەیە، وە لە مامەڵەکردنی لەگەڵ خوودی خۆیدا، وە لە مامەڵەکردنیشی لەگەڵ کۆمەڵگاکەیدا.

وە دادوەری لە ئیسلامدا بەدی نایەت ئیللا بە پەیڕەوکردنی شەرعی خوا نەبێت و بە پەیڕەوکردنی سنوورەکانی نەبێت لە هەموو بوارەکانی ژیاندا.

وە سەبارەت بە یەکسانیش: ئەوا بەڕاستی ئیسلام یەکسانی کردووە لە نێوان هەموو مرۆڤەکاندا، خوای گەورە فەرموویەتی:

---

(1) سورەتی النحل: 90

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقۡنَـٰكُم مِّن ذَكَرٖ وَأُنثَىٰ﴾[1]. واته: ئەی خەڵکینە بەڕاستی ئێمە ئێوەمان لە نێرینە و مێیینەیەک دروست کردووە .

وە پێغەمبەریش ﷺ فەرموویەتی: ((النَّاسُ كُلُّهُمْ بَنُو آدَمَ، وَآدَمُ خُلِقَ مِنْ تُرَابٍ))[2]. واتە: خەڵکی هەموویان نەوەی ئادەمن، وە ئادەمیش لە خۆڵ دروستکراوە.

ئیسلام یەکسانی کردووە لە نێوان نێرینە و مێیینەدا لە ڕێز و حورمەتی مرۆڤایەتی بووندا، وە لە چێژبینین لە ژیانی ڕێزدارانەدا، وە لە ئەرکە شەرعییەکاندا، وە لە سزاکانی دواڕۆژیشدا، بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا ئیسلام وا دەبینێت کە هەر یەکێک لە پیاو و ئافرەت تایبەتمەندی خۆیی هەیە لە هەندێک لە ئەحکامەکاندا بەوەی کە لەبارە و دەگونجێت لەگەڵ پێکهاتەی دروست کردنی جەستەیی و لایەنی کۆمەڵایەتی و دەروونی هەر یەکێکیان .

وە ئیسلام حەق و مافی ئافرەتانی داوە و ئەو پلە و پێگەیەی پێداون کە شیاوە و لەبارە بۆیان، وە پاراستوونی لە هەموو ئەو شتانەی کە خراپەی تێدایە بۆیان .

موسڵمانان: ئەمە دین و ئاینەکەتانە شانازی پێوە بکەن و سەروەری پێوە بخوازن و متمانەتان پێی هەبێت و دەستی پێوە بگرن، وە بیشزانن کەوا خێر و خۆشی دونیا و دواڕۆژی کۆکردووتەوە بۆتان، وە ئیسلام ئەوەی تێدایە بۆتان کە بێپێویستتان بکات لە جگە لە خۆی لە پرۆگرامە دەستکردەکانی مرۆڤـ .

* بانگەوازێک بۆ تێکڕای موسڵمانان:

موسڵمانان:

ئەی ئەوانەی کە خوای گەورە کۆی کردوونەتەوە لەسەر برایەتی ئیسلام وپەیوەندی ئیمان: لە خوودی خۆتاندا لە خوابترسن و وریابن لە پلانەکانی ئەو دوژمنانەتان کە خۆیان خلیسکاندووەتە نێواتانەوە، ئەوانەی کە دەیانەوێت برایەتیتان بڕوشێنن و پلیتەی دوژمنایەتی لە نێوان ئێوە وسەرکردەکانتاندا گڕتێبەربدەن.

---

(1) سورەتی الحجرات: 13

(2) صحيح سنن الترمذي ح : (3955) وصحيح الـجامع الصغير ح : (4568) .

بۆیە لە خوودی خۆتاندا لە خوابترسن و ڕێز و حورمەت لە خوێن و ماڵ و نامووسەکان بگرن، وە بەرژەوەندییە بەرزەکانی ئوممەت بخەنە سەرووی هەموو پێوەرێکەوە، وە لە پێناو ئەوەدا هەموو جیاوازییەک لە بیر وبۆچووندا تێپەڕێنن.

وە هەوڵی چارەسەرکردنی کێشەکانتان بدەن بە ژیری وحیکمەت ودانایییەوە، نەک بە خوێن ڕشتن و کاولکردنی ماڵی گشتی.

* بانگەوازێک بۆ سەرکردەکانی موسڵمانان:

ئەی سەرکردەکان:

لە خوابترسن لە ئاست میللەتەکانتان، وە چارەسەری کێشە وپرسە کۆمەڵایەتیەکانیان بکەن لە هەژاری ونەزانی وبێکاری و بێبەشبوون، وە وریابن لەوەی کە بیانتۆقێنن وئەو چەکانەی کە لەخۆتانتان گرتووە بۆ دوژمنانتان ڕوویان بکەنە ڕووی میللەتەکانتان، وە وریابن لەوەی کە هەڵسوکەوتی کوشتار کردن وبێبەش کردن وبرسی کردن بەکاربێنن لە پێناو بێدەنگ کردنیان، ئەمە کارێکی باتڵ ونارەوایە وخوای گەورە پێی ڕازی نابێت .

* بانگەوازێک بۆ خاوەنی کەناڵە ئاسمانییەکان:

ئەی خاوەنی کەناڵە ئاسمانییەکان:

لە خوودی خۆتاندا لە خوابترسن وبشزانن کە بەرپرسیارێتی ئێوە لە ئاست ئاینەکەتان و لە ئاست کۆمەڵگاکەتان بەرپرسیارێتیەکی گەورەیە، بۆیە سووربن لەسەر ئەوەی کە کەناڵەکانتان وتەی ئوممەت یەکخات وکۆی بکاتەوە، وە وریایان بکاتەوە لە کەوتنە ناو جیاوازی و ناکۆکیەوە، وە وریابن لەوەی کە بەکاری بێنن بۆ پەرتەوازە کردنی ئوممەت و بانگەواز کردن بۆ هەرکەس بۆخۆیی و خوێن ڕشتن و کاولکردنی ماڵی گشتی.

* بانگەوازێک بۆ کەسانی دروستکاری بڕیار لە ناو ڕێکخراوە نێودەوڵەتیەکاندا:

ئەی کەسانی دروستکاری بڕیار لە ناو ڕێکخراوە نێودەوڵەتیەکان ودانیشتگا نەتەوەییەکان:

بە لاتانەوە شاراوە نییە کە موسڵمانان چ تایبەتمەندیەکیان هەیە لە پەیوەستبوونیان بە ئەحکامەکانی ئاینەکەیان وبنەما جێگیرەکانی شەریعەتەکەیانەوە، بۆیە پێویستە لەسەرتان ئەمە لەبەرچاوتان بگرن لە کاتێکدا کە یاسایەک دادەهێنن ودایدەڕێژن

کە پێچەوانەی شەرعی خوایە، بەوەی کە ئوممەتی ئیسلام ناچار نەکەن بە پەیوەست بوون پێیەوە، وە فشاری نەخرێتەسەر لەپێناو قەبوڵ کردنیان بۆ ئەوەی کە پێچەوانەی ئاین وبیروباوەڕەکەیانە .

وە ئەمەیش چەند سوودێکی تێدا بەدی دێت:

یەکەم: ڕێزگرتن لە ویستی میللەتانی ئیسلامی لە پەیوەست بوونیان بە ئەحکامەکانی ئاینەکەیانەوە.

دووەم: ئەوەی کە ئەم ڕێکخراوانە متمانەی موسڵمانان بە دەست بخەن بۆ خۆیان، وە تێڕوانینێکی ئیجابیان هەبێت لە ئاستیاندا، وە هاوکاریان لەگەڵدا بکەن لەوەی کە خزمەتی ئوممەتی ئیسلام دەکات، لەگەڵ تێبینی هەبوون وخۆپاراستن لە ئەو خاڵانەی کە پێچەوانەی شەرعی خوایە.

* بانگەوازێک بۆ حاجییانی ماڵی خوای حورمەت لێنراو:

حاجییانی ماڵی خوای حورمەت لێنراو:

شوکر و سوپاسی خوا بکەن لەسەر نیعمەتی ئەوەی کە گەیاندوونی بە ئەم وڵاتە پیرۆزە و ئێوەیش هاتوونەتە ناوی و بینوتانە کە ئەمن و ئەمانە، بۆیە سوپاسی خوا بکەن لەسەر ئەم نیعمەتە .

وە سووربن ـ خوا بەرەکەتی برێژێت بەسەرتاندا ـ سووربن لەسەر ئەوەی کە ئەم دروشمە بەڕاستی ونیازپاکیەوە ئەنجام بدەن وشوێنکەوتەی کتێبەکەی پەروەردگارتان و ڕێبازی پێغەمبەرەکەتان ﷺ بن .

حاجییانی ماڵی خوای حورمەت لێنراو:

بە چاوی بەرچاوڕۆشنیەوە سەیری ئەوە بکەن کە خوا منەتی کردووە بەسەر ئەم وڵاتەدا لە ئەم ئەمن و ئەم بەرقەراربوون و پەیوەندیەی نێوان کاربەدەستان و هاوڵاتیان، پاشان سەیری ئەوە بکەن کە پێشکەشتان کراوە لە ئاسانکاری و ئەوەی کە ئەنجامدراوە لە فراوان کردنی هەردوو حەرەمی مەککە و مەدینە و شوێنەکانی ئەنجامدانی کارەکانی حەج و عومرە و ئەو هەموو خزمەتگوزاریە جۆراوجۆرانەی کە پێشکەشتان کراوە، هەموو ئەمانە بە فەزڵی خوا بووە پاشان بە گرنگی و بایەخ پێدانی سەرکردەکانی ئەم وڵاتە بووە خوای گەورە موفەقیان بکات بۆ ئەوەی کە خۆشی دەوێت و پێی ڕازیە .

حاجییانی ماڵی خوای حورمەت لێنراو:

بزانن کەوا کەسانێک لە دوژمنانی ئوممەتی ئیسلام خۆیان خزاندووەتە نێوان ڕێزیەکانتانەوە، وە شەڕ و بەڵایان دەوێت بۆ ئەم وڵاتە و دەیانەوێت هەستن بە کرداری ئاژاوەگێری و تێکدان، بۆیە ببن بە چاوێکی بەئاگا ونەخەتوو، وە ببن بە یەک دەست و بەربەستێکی توکمە و ڕێگر لە بەرامبەر ئەو تێکدەرانە.

موسڵمانان: بەڕاستی حەج لە ئیسلامدا دانەنراوە بۆ دەربڕینی قسەی پڕوپووچ ویەکلاکردنەوەی حیسابات وبەرز کردنەوەی دروشمەکانی نەفامی وبەدیهێنانی بەرژەوەندییە شەخسییەکان ومەبەستە سیاسییەکان وبانگەشە ڕقلێبووەکان! بەڵکو لە ئیسلامدا حەج دانراوە بۆ پەرستنی خوای گەورە وخۆنزیک کردنەوە لێی، وە بۆ کۆکردنەوەی وتەی موسڵمانان و یەکخستنەوەی دڵەکان و یەکڕیزی ئوممەتی ئیسلام، بۆیە وریابن لە پلانی دوژمنان .

کەواتە حەج نەهاتووە بۆ ئەوەی ببێتە مینبەری سیاسی و مینبەری دەربڕینی قسەی پڕوپووچ، هەموو ئەمانە لەو کارانەیە کە ئیسلام ڕێگری لێدەکات، بۆیە لە خوودی خۆتاندا لە خوابترسن .

بەندەکانی خوا: شوکر وسوپاسی خوا بکەن لەسەر ئەم نیعمەتە، وە دوعا بکەن بۆ کاربەدەستانی ئەم وڵاتە بەوەی کە خوا موەفەقیان بکات وبیانخاتە سەر ڕاستی، ئەوان چەند لە چاکەیان بەخشیوە وچەند هەوڵیان بەگڕخستووە وڕێگاوبانیان ئاسایش وئارام کردووە وهەموو خزمەتگوزاریەکانیان ئامادە کردووە لەپێناو ئاسوودەیی حاجیەکاندا.

* فەزڵی ڕۆژی عەرەفە:

حاجییانی ماڵی خوای حورمەت لێنراو:

ئەمڕۆ ئێوە لە ڕۆژێکدان لە باشترین ڕۆژەکان کە ڕۆژی عەرەفەیە، ئەو ڕۆژە گەورەیەیە کە خوای پەروەردگار تێیدا دینی کامڵ کردووە و نیعمەتی ئیسلامی تێدا تەواو کردووە و ڕازی بووە کە ئیسلام دین و ئاینمان بێت، خوای گەورە فەرموویەت:﴿ ٱلۡيَوۡمَ أَكۡمَلۡتُ لَكُمۡ دِينَكُمۡ وَأَتۡمَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ نِعۡمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلۡإِسۡلَٰمَ دِينٗاۚ﴾[1]. واتە: ئەمڕۆ من دینەکەتانم بۆ کامڵ کرد و نیعمەتی خۆمم بە تەواوی دابەسەرتانا و بە ئیسلامیش ڕازی بووم ببێت بە دین و ئاینتان .

وە باشترین دوعا دوعای ڕۆژی عەرەفەیە هەروەکو پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: ((خَيْرُ الدُّعَاءِ دُعَاءُ يَوْمِ عَرَفَةَ، وَخَيْرُ مَا قُلْتُ أَنَا وَالنَّبِيُّونَ مِنْ قَبْلِي : لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ)) [2].

واتە: باشترین دوعا دوعای ڕۆژی عەرەفەیە، وە باشترین وتیەک کە من و پێغەمبەرانی پێش من وتبێتمان بریتییە لە وتەی: (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، وَحْدَهُ لاَ

---

(1) سورەتی المائدة: 3

(2) رواه الترمذي في سننه : (5 / 464 ) ح : (3585) .

شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ) .واته: هيچ پەرستراوێک نييه شايستەی پەرستن بێت جگە له خوا، تەنهايه و بێ شەريکه، موڵک و ستايش تەنها بۆ ئەوە ، وە ئەويش بەسەر هەموو شتێکدا بە توانايه .

ئەمە ئەو ڕۆژەيه کە: ((مَا رُئِيَ الشَّيْطَانُ يَوْمًا هُوَ فِيهِ أَصْغَرُ وَلاَ أَدْحَرُ وَلاَ أَحْقَرُ وَلاَ أَغْيَظُ مِنْهُ فِي يَوْمِ عَرَفَةَ)) [1].

واته: "هيچ ڕۆژێک نييه شەيتانی تێدا ببينرابێت بچوکتر و لووت شکاوتر و سووک و ريسواتر و پۆخنتر و داخ لەدڵتر بێت وەک لە ڕۆژی عەرەفە" .

هەر بۆيه ئەم ڕۆژە پيرۆزە وەک دەستکەوت بە دەست بخەن وخۆتان بدەنەبەر ڕەحمەت و ميهرەبانی و بەخششی پەروەردگارتا، وە نيازتان پاک بکەنەوە بۆ خوا بە کردەوەکانتان، وە داوای چاوپۆشی و لێبوردنی لێبکەن لەو تاوان و کەموکوڕييانەی کە ڕابووردووە، وە داوای فەزڵ وبەخششی خۆيی لێبکەن، چونکە بەڕاستی خوا بەخشندە و دەستکراوە و لێبووردە ولێخۆشبوو و بە بەزەييە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموويەتی : ((مَا مِنْ يَوْمٍ أَكْثَرَ مِنْ أَنْ يُعْتِقَ اللَّهُ فِيهِ عَبْدًا مِنَ النَّارِ مِنْ يَوْمِ عَرَفَةَ، وَإِنَّهُ لَيَدْنُو ثُمَّ يُبَاهِي بِهِمُ الْمَلاَئِكَةَ فَيَقُولُ: مَا أَرَادَ هَؤُلاَءِ ؟))[2].

واته: هيچ ڕۆژێک نييه کە خوای گەورە تێيدا بەندە ئازادبکات لە ئاگر وەکو ڕۆژی عەرەفە، وە خوای گەورە نزيک دەبێتەوە و ئەنجا شانازی دەکات بە ئامادەبووانی عەرەفەوە بەسەر فەريشتەکانەوە ودەفەرموێت: ئەوانە چيان دەوێت؟

ئەمە ڕۆژێکە خوای گەورە تێيدا دادەبەزێت بۆ ئاسمانی دونيا وشانازی دەکات بە ئامادەبووانی عەرەفەوە بەسەر فەريشتەکانەوە و دەفەرموێت: ((انْظُرُوا إِلَى عِبَادِي أَتَوْنِي شُعْثاً غُبْراً ضَاحِينَ مِنْ كُلِّ فَجٍّ عَمِيقٍ، أُشْهِدُكُمْ أَنِّي قَدْ غَفَرْتُ لَهُمْ))

---

(1) رواه مالك في "الـموطأ" : (3 / 621) ، والبيهقي في "شعب الإيـمان" : (3 / 461) ح : (4069) .

(2) رواه مسلم في صحيحه : (2 / 982) ح : (1348) .

[1]. واتە: سەیری عەبدەکانم بکەن بە سەر و سیما شپرز وخۆڵ و تۆزاوی و لە پێش خۆر و بێسێبەر لە هەموو ڕێگاوبانێکی دوورەوە هاتوون، ئێوە دەکەم بە شایەت کەوا من لێیان خۆشبووم .

ئەمە ڕۆژێکی گەورەیە تێیدا بوەستن ـ خوا بەرەکەتی برێژێت بەسەرتاندا ـ تاوەکو خۆرئاوادەبێت، وە هەموو سنووری عەرەفە شوێنی وەستانە، وە وورد ببنەوە لە سنوور و نیشانەکانی، وە لە ئەم ڕۆژەدا نیازپاک بن بۆ خوا وملکەچی خۆتان دەربڕن لەبەر دەستیدا، ئومێدەواری ڕەحمەتی بن، لە تۆڵە وسزای بترسن، خۆتان لە خوا نزیک بکەنەوە بە زیکر کردنی ولـێپاڕانەوەی و ملکەچی دەربڕن لەبەر دەستیدا، چونکە بەڕاستی خوا نزیکە و وەڵامدەرەوەیە.

* کردەوەکانی حەج لە ڕۆژی عەرەفە و ڕۆژەکانی دوای ئەوە:

لە عەرەفەدا بوەستن تاوەکو خۆرئاوابوون، وە لە عەرەفەدا هەردوو نوێژی نیوەڕۆ وعەسر بکەن بە کۆکردنەوە وکورت کردنەوە "جەمع وقەصر" ـ هەروەکو چۆن إن شاء الله ئەنجامی دەدەین، ئەنجا لە پاش خۆرئاوابوون عەرەفە بە جێبێڵن و بڕۆن بەڵام لە پێش خۆر ئاوابوون نەڕۆن .

بڕۆن بۆ موزدەلیفە، وە هەر کاتێک گەیشتنە ئەوێ لەوێ هەردوو نوێژی مەغریب و عیشا بکەن بە کۆکردنەوە و کورت کردنەوە "جەمع و قەێر"، وە شەو لەوێ بخەون و بمێننەوە تاوەکو نوێژی بەیانی، وە کەسانی لاواز و کەم توانا دەتوانن لە دوای نیوەی شەو لەوێ بڕۆن، وە بۆ ئەو کەسانەی کە توانایان هەیە باشتر وایە کە لەوێ بمێننەوە تاوەکو نوێژی بەیانی تێدا دەکەن و پاشان بڕۆن .

پاشان لە موزدەلیفەوە بگەڕێنەوە بۆ مینا و لەوێ بەرد بهاوێژنە ناو (حەوزی عەقەبە / حەوزە گەورەکە)، پاشان سەرتان بتاشن یان کورتی بکەنەوە، وە لە دوای ئەمەوە هەموو شتێکتان بۆ حەڵاڵ دەبێت جگە لە ئافرەت، پاشان تەواف بکەن بە دەوری ماڵی خوادا و سەعی نێوان یەفا و مەرەوە بکەن، وە لە دوای

---

(1) رواه ابن خزيـمة في صحيحه : (4 / 263) ح : (284) .

قوله : "شُعْثاً" : أي : غير مرجلين لشعورهم ، "غُبْرَاً" : أي : أصابـهم الغُبار من جهد السـفر وأداء المناسك ، "ضَاحِينَ" : أي : بارزين للشمس لا يظلهـم شيء ، "مِـنْ كُلِّ فَـجٍّ عَمِيـقٍ" أي : مـن كل طريق بعيد .

ئەمەوە هەموو شتێکتان بۆ حەڵاڵ دەبێت کە حەرام کرابوو لەسەرتان تەنانەت ئافرەتیش.

پاشان لە هەر سێ ڕۆژەکەدا لە پاش لادانی خۆر لە ناوەڕاستی ئاسمان بەردەکان بهاوێژنە ناو هەر سێ حەوزەکە، لە هەردوو ڕۆژی دووشەمە وسێشەمە[1] بۆ کەسێک کە بیەوێت پەلە بکات، وە ڕۆژی چوارشەمەیش بۆ کەسێک کە دوابکەوێت.

پاشان ماڵ ئاوایی بکەن لە ماڵی خوا وبە سەلامەتی وئارامیەوە بگەڕێنەوە.

* ئامۆژگاری و وەبیرهێنانەوەیەک:

بەڕاستی مردن کۆتایی هەموو زیندوویەکە، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿كُلُّ مَنْ عَلَيْهَا فَانٍ ۝٢٦ وَيَبْقَىٰ وَجْهُ رَبِّكَ ذُو ٱلْجَلَٰلِ وَٱلْإِكْرَامِ﴾[2]. واتە: هەموو کەسێک کۆتایی پێدێت، وە ڕوومەتی گەورە وڕێزداری پەروەدگارت دەمێنێتەوە .

هەروەها فەرموویەتی: ﴿كُلُّ نَفْسٍ ذَآئِقَةُ ٱلْمَوْتِۗ وَإِنَّمَا تُوَفَّوْنَ أُجُورَكُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِۖ﴾[3].

واتە: هەموو کەسێک مردن دەچێژێت، وە بەڕاستی ئێوە لە ڕۆژی قیامەتدا پاداشتی خۆتان وەردەگرنەوە .

بە مردنی مرۆڤـ کردەوەکانی دەبڕێتەوە و ئەنجا لـێپرسینەوە و پاداشت بەدیدێت .

---

(1) ئەمە لە ساڵی (١٤٣٢) کۆچیدا، چونکە لەم ساڵەدا ڕۆژی یانزەیەمی مانگی حاجییان ڕۆژی دووشەمە بوو، وە ڕۆژی دوانزەیەم سێشەمە بوو، وە ڕۆژی سیانزەیەم چوارشەمە بوو.

(2) سورەتی الرحمن: **26**و**27**

(3) سورەتی ال عمران: **185**

برای موسڵمانم: ساتەوەختی سەرەمەرگ و جیابوونەوەت لە ئەم دونیایە وەبیری خۆت بهێنەوە، خوای گەورە فەرموویەتی:

﴿وَجَآءَتۡ سَكۡرَةُ ٱلۡمَوۡتِ بِٱلۡحَقِّۖ ذَٰلِكَ مَا كُنتَ مِنۡهُ تَحِيدُ﴾[1].

واتە: نارەحەتیەکانی کاتی مردن بەڕاستی هات، ئەوە ئەوەیە کە نەتدەتوانی خۆتی لـێلابدەیت.

برام: قەبر وتاریکی قەبر وەبیری خۆت بهێنەوە، وە بەڕاستی قەبر یان باخچەیەکە لە باخچەکانی بەهەشت یان چاڵێکە لە چاڵەکانی ئاگری دۆزەخ.

برام: ڕاوەستان لەبەردەستی خوای گەورەدا لە ئەو مەوقیفە گەورە و ئەو مەترسییە زۆرەدا لە ڕۆژێکدا کە ئەندازەکەی پەنجا هەزار ساڵە وەبیری خۆت بهێنەوە، ڕۆژێک کە تێیدا لەبەردەستی خوادا ڕادەوەستین لەشەکانمان رووتە و پێیەکانمانیش پەتیە و چاوەکانمان ئەبڵەقە.

ئەو ڕۆژە گەورەیە وەبیری خۆت بهێنەوە کە تێیدا خۆر نزیک دەبێتەوە لە سەری بەندەکان بە ئەندازەی یەک میل، ئەوانیش دەخرێنە نێو ئارەقی خۆیانەوە بە پێی کردەوەکانیان، هی وایان هەیە تاوەکو هەردوو قولەپێی، وە هی واشیان هەیە تاوەکو هەردوو لاکەلەکەی، وە هی واشیان هەیە ئارەق قووتی دەداتەوە و دەیپۆشێت[2].

ڕۆژی نمایش کردنی بەندەکان بۆ خوای گەورە وەبیری خۆتان بهێننەوە خوای گەورە فەرموویەتی:﴿يَوۡمَئِذٖ تُعۡرَضُونَ لَا تَخۡفَىٰ مِنكُمۡ خَافِيَةٞ﴾[3]. واتە : لەو ڕۆژەدا نمایش دەکرێن و هیچ شتێکتان لـێ شاراوە نابێت.

---

(**1**) سورەتی ق: **19**

(**2**) ورد معنـى ذلك في الـحديث الذي رواه ابن حبان في صحيحه : (16 / 325) ح : (7330) .

(**3**) سورەتی الحاقة: **18**

کێشانە کردنی کردەوەکان وەبیری خۆت بهێنەوە، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَمَن ثَقُلَتْ مَوَٰزِينُهُۥ فَأُوْلَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿١٠٢﴾ وَمَنْ خَفَّتْ مَوَٰزِينُهُۥ فَأُوْلَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓاْ أَنفُسَهُمْ فِى جَهَنَّمَ خَـٰلِدُونَ﴾[1].

واتە: هەرکەسێک تەرازووی چاکەکانی [یان کردەوە چاکەکانی] قورس بوو ئەوا ئەو کەسانە سەرکەوتوو و براوەن ێ وە هەرکەسێکیش تەرازووی چاکەکانی [یان کردەوە چاکەکانی] سووک بوو ئەوانە ئەو کەسانەن کە خۆیانیان دۆڕاندووە و لە دۆزەخدا بە هەتاهەتایی دەمێننەوە.

برام: ئەو ڕۆژە وەبیری خۆت بهێنەوە کە تێیدا مۆڵەت دەدرێت بە ئیماندارن بەوەی کە بڕۆنە ناو بەهەشتەوە، وە ئەو ڕۆژەیش وەبیری خۆت بهێنەوە کە بانگکەرێک بانگ دەکات ودەڵێت: ئەی ئەهلی بەهەشت: ((إِنَّ لَكُمْ أَنْ تَصِحُّوا فَلاَ تَسْقَمُوا أَبَدًا، وَإِنَّ لَكُمْ أَنْ تَحْيَوْا فَلاَ تَمُوتُوا أَبَدًا، وَإِنَّ لَكُمْ أَنْ تَشِبُّوا فَلاَ تَهْرَمُوا أَبَدًا، وَإِنَّ لَكُمْ أَنْ تَنْعَمُوا فَلاَ تَبْتَئِسُوا أَبَدًا))[2].

واتە: ئەی ئەهلی بەهەشت: ئێوە ئەوەتان بۆ هەیە کە هەمیشە لەش ساغ بن و هەرگیز نەخۆش نەکەون، وە ئەوەشتان بۆ هەیە کە هەمیشە بژین وهەرگیز نەمرن، وە ئەوەشتان بۆ هەیە کە هەمیشە لە خۆشیدابن و هەرگیز ناڕەحەت بوون و غەمباری نەبینن .

وە ئەو ڕۆژە وەبیری خۆت بهێنەوە کە بانگکەرێک بانگ دەکات و دەڵێت: ئەی ئەهلی بەهەشت: ((إِنَّ لَكُمْ عِنْدَ اللَّهِ مَوْعِدًا يُرِيدُ أَنْ يُنْجِزَكُمُوهُ، قَالُوا: وَمَا هُوَ؟ أَلَمْ يُبَيِّضْ وُجُوهَنَا، وَيُنَجِّنَا مِنَ النَّارِ، وَيُدْخِلْنَا الْجَنَّةَ، وَيُنْجِّنَا مِنَ النَّارِ؟ قَالُوا: بَلَى، فَيُكْشَفُ الْحِجَابُ، فَيَنْظُرُونَ إِلَى وَجْهِ اللَّهِ، فَمَا أُعْطُوا نَعِيْمًا مِثْلَ هَذَا النَّعِيم)) [3].

---

(**1**) سورەتی المؤمنون: **102**و**103**

(**2**) رواه مسلم في صحيحه : (4 / 2182) ح : (2837) .

(**3**) ورد معنى ذلك في الحديث الذي رواه الترمذي في سننه (4 / 268) ح : (2552) ، وابن ماجه في سننه (1 / 67) ح : (187) .

واتە: ئەی ئەهلی بەهەشت: بەڕاستی ئێوە وەعد و بەڵێنێکتان هەیە لای خوا دەیەوێت کە بۆتانی بەجێبێنێت، ئەوانیش دەڵێن: ئەو وەعد و بەڵێنە کامەیە؟ ئەوە نییە خوای گەورە ڕوومەتمانی سپی کردووەتەوە، وە خستوومانێتە ناو بەهەشتەوە و لە ئاگری دۆزەخیش ڕزگاری کردووین؟ دەڵێن: بەڵێ، لەو ساتەوەختەدا پەردە لادەبرێت و ئەوانیش سەیری ڕوومەتی خوا دەکەن، بەڕاستی هیچ خۆشیەکیان پێنەدراوە وەکو ئەم خۆشییە .

وە ئەو ڕۆژە وەبیری خۆت بهێنەوە کە بانگکەرێک بانگ دەکات و دەڵێت: ئەی ئەهلی بەهەشت: ((يَا أَهْلَ الْجَنَّةِ خُلُودٌ فَلاَ مَوْتَ، وَيَا أَهْلَ النَّارِ خُلُودٌ فَلاَ مَوْتَ)) [1].

واتە: ئەی ئەهلی بەهەشت: ئەوە ئیتر ژیانی هەتاهەتاییيە و مردن نەما، وە ئەی ئەهلی ئاگر: ئەوە ئیتر ژیانی هەتاهەتاییيە و مردن نەما.

بگەڕێنەوە بۆ لای خوا و تەوبە بکەن لە وتە و کردەوە خراپەکانتان تەوبەیەکی پاک ویەکجار لە هەموو تاوانەکان، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ تُوبُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ تَوْبَةً نَّصُوحًا﴾[2]. واتە: ئەی ئەو کەسانەی کە باوەڕتان هێناوە تەوبە بکەن و بگەڕێنەوە بۆ لای خوا تەوبەیەکی پاک و یەکجار لە هەموو تاوانەکان .

وە پارێزگاری بکەن لەسەر فەرزەکانی ئیسلام لە نوێژ و زەکات و ڕۆژوو وحەج وڕەوشتە پیرۆزەکان، وە خۆتان بە دوور بگرن لەوەی کە خوا حەرامی کردووە لەسەرتان.

* دوعا و پاڕانەوە:

خوایە ئیسلام وموسڵمانان سەربەز وباڵادەست بکە، وە شیرک وموشریکینیش زەلیل و ڕیسوا بکە، وە دوژمنانی دین تێک و پێک بدە، وە عەبدە یەکخواپەرستەکانت سەربخە، خوایە ئەم وڵاتە وتێکڕای وڵاتانی موسڵمانان ئەمن وئاسایش بەرقەرار وئارام وئاسوودە بکە ئەی پەروەردکاری هەموو جیهانیان.

---

(1) رواه البخاري في صحيحه : (4 / 1760) ح : (4453) ومسلم في صحيحه : (4 / 2188) ح : (2849) .

(2) سورەتی التحریم: 8

خوایه له ئیماندارانی پیاو وئافرەت و له موسڵمانانی پیاو وئافرەت خۆشببه، وه دڵەكانیان یەكبخه، وه نێوانیان چاك بكه، وه سەریان بخه بەسەر دوژمنی خۆت و دوژمنی ئەوانیش.

خوایه سەركردەكانی موسڵمانان چاك وئیصڵاح بكه، وه نێوان ئەوان وهاوڵاتیانی ژێر دەسەڵاتیان كۆبكەرەوە لەسەر باشترین حاڵ، وه له فیتنه وئاشووب به دووریان بگره ئەوەی دیاره و ئەوەشی كه شاراوه و نادیاره.

* كۆتایی:

داوا له خوا دەكەم كه من و ئێوەیش موەفەق بكات بۆ ئەوەی كه خۆشی دەوێت و پێی ڕازییه.

﴿رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِي ٱلدُّنۡيَا حَسَنَةٗ وَفِي ٱلۡأٓخِرَةِ حَسَنَةٗ وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ﴾[1].

ئەی پەروەردگارمان له دونیادا چاكەمان بدەرێ وله دواڕۆژیشدا چاكەمان بدەرێ و بشمانپارێزه له سزای ئاگر.

وصلى الله وسلم على نبينا محمد وعلى آله وصحبه وسلم

لەبڵاوكراوەكانی/ ماڵپەڕی بەهەشت

(1) سورەتی البقرة: **201**